## پێشەکی

مەیگێڕ وەرە تۆ خودا دەسا دەی
بۆم تێکە دە جامی جەم قومێ مەی

تا پیاڵە لەمن جیهان نوما بێ
دڵخوازی مە* گشتی ئاشکرا بێ
*مە : ئێمە ، هی ئێمە.

ڕوون بێتەوە بۆم شتی نهێنی
پرسێکی گرانە بۆم هەڵێنی

ڕێوشوێنی وەهایە چەرخی گەردوون
نەویایەتییە *لە پاش بەرز بوون
*نەوی : نزم ــ نەویایەتییە : نزم بوون ، بە کەمایەسی داکەوتن.

بەدبەختی سەری لە ئێمە داوە
تۆزکاڵێ کەمایەسی نەماوە

ئاخۆ دەبێ ڕوو بکاتە کەم بوون
یا خۆ هەر ئەبێ بە مانی گەدوون

تۆ بڵێی کە هەڵێ چ زوو چ دێرێک
بۆ ئێمە لە عاسمان ستێرێک ؟

بەختی مە لە خەو هەڵستێ جارێک
جارێک بکەوێتە کار و بارێک

لێن* هەڵبکەوێ جیهانپەنایەک
پەیدا ببێ بۆ مە پادشایەک
*لێن : لە زاراوەیی مەنگوڕایەتیدا بە واتای «لێمان، لە ئێمە » دەکار دەکرێت .

بۆ نووکی بنووس پەیابێ مایە
شیری هونەری مە بێتە کایە

ئەم بەختە ڕەشەی لەسەر مە ڕاکا
کوردیش لە جیهان برەو* پەیا کا
*برەو : ڕمێن ، ڕەواج ، بازاڕ .

بۆ مەش کە ببایە سەربڵندێک
زۆرزان و بەبیر و مەرد و ڕەندێک

نەخشێ* لە دراوی مەش درابوو
بێ نرخ و چرووک و باو نەمابوو
*نەخشی سەر دراو : نەخشێک کە سەر پارە و دراو چاپ دەکرێت.

بێ سۆیە کە زێر و زێوی ساکار
نرخی نییە چەشنی هی نیشاندار

بۆمەش کە هەبایە پادشایێ
خوا تانجێکی پێ ببەخشیایێ

پەیدا دەبوو ڕێز و گەورەیی و ناو
ڕەنگ و کری* مەش دەهاتە بەر چاو
*کر : دەسکار ، کردە، تەنراو، چندراو.

ئێمەی لە کەساسی دەر دەهێنا
بێستانی هیوای وەبەر دەهێنا

ترکان نەدەبوون بەسەر مە دا زاڵ
بۆ کوند نەدەبووینە لانە و ماڵ

چۆن بۆ عەجەمان دەبووینە ژێردەست؟
ژێردەستی شتی وەها نەوی و پەست

هەر ڕۆژی بەرێ خودای توانا
ڕۆم و عەجەمی لەسەر مە دانا

بێ شەرمییە ژێردەسی ئەمانە
ئەم شەرمە لە پیاوە گەورەکانە

شوورەییە لە میر و نامداران
سووچیان چییە هۆنەر و هەژاران

کێ دەستی درێژ بکاتە شیری
هەرچی بیەوێ دەخاتە گیری

ئەم بووکی جیهانە بۆ کوڕێکە
شیرێکی بە دەست و شێر دڕێکە

خشڵ و جل و شیرنی و نیشانی
بەخشینە بە بیر و ڕێگەزانی

پرسیم لە جیهان ڕەقی لە بەردی
نەرمیت بە چییە؟ گوتی بە مەردی

دنیا کە وەها بە بەخشش و، شێر
بۆ پیاو دەسەمۆ دەبێت و دەسگێر

سا خوایە لە تۆ سەیر دەمێنم
لەو گێژە چلۆن سەرم دەرێنم

کورد چۆن دەبێ دیل و چارەڕەش بن
کەی ڕاستە لە خۆشی دوورەبەش بن

بۆ بەخشش و دڵ بەناو و دەنگن
شێرن لە هەرا، پڵنگی جەنگن

دەست ڕژدی ئەمانە حاتەمێکە
هەر گوردێ لەوانە ڕۆستەمێکە

بۆ ڕۆم و عەجەم وەکوو دیوارن
ئەم هۆیە کە وا کز و هەژارن

گۆپاڵی دەسی ئەوانە ئێمەین
بۆ تیری بەڵا نیشانە ئێمەین

خۆیان لە گەڕ و هەرایە دوورن
کورد بەند و کلیلی سەر سنوورن

یەک هێرشی بۆ سەر ئیدی بێنێ
هەر کوردە دەبن شەڵاڵی خوێنێ

ئازایی و بەخششێ بپرسی
مەردایەتیی و دڵ و نەترسی

هەر بۆ کوڕی کوردسان هەیە و بەس
نەدراوە لەبەر ئەوان بەشی کەس

هێندەی کە بە جەرگ و دوورە ترسن
کەمتر لە بە یەک گەیین دەپرسن

کەس بۆ کەسێ نابێ چاو دەبەر بێ
هەرکەس دەیەوێ زل و لەسەر بێ

لەم سەر ڕەقییە و دەماری زلیان
بێگانە دەبن سواری ملیان

هەر خۆیەتی زل، کەوە و ڕەش و بۆر
هەر بۆیەیە بوونە هێزی خۆ خۆر

کوردیش کە ببایە یەکدڵ و دەست
دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست

ڕۆم و عەرەب و عەجەم سەر و بەر
بۆ ئێمە بەنێ دەبوون و نۆکەر

پەیدا دەبوو باو و گەورەیی و ژین
ناومان دەر ئەکرد بەبیر و زانین

جیاواز دەبوو گفتی پاک و ناپاک
پڕ نرخ و بەڕێز دەبوو شتی چاک

## هۆی نووسینی چیرۆکی «مەم» و «زین»

تۆمەز لە وڕی* و نەزانی خانی
دەشتی هونەری بە چۆلگە زانی
*وڕی : گێژی.

واتا نە بە زیرەکی و بە ژیری
سەربەرزیی هۆزی هاتە بیری

لاساری هێنانە بەر، بەسەر چوو
با پێشی بڵێن لە ڕێگە دەرچوو

پاڵاوی ڕژاند و تڵتی نۆشی
وەک فارسی وا زمانی خۆشی

هۆنیوەتەوە بە بەند و ساڵێک
بۆی ماندوو بووە بە هۆی خەیاڵێک

بێگانە نەڵێن کە کورد نەزانن
بێ نووسەر و هۆنەر و زمانن

پێمان نەڵێ وێژەوانی بیر ورد
دڵداری نەبوو لە نێو گەلی کورد

کوا ؟ ئێوه نه دڵتەرن نه دڵبەر
لەم ڕێگه نه ڕێڕەون نه ڕێبەر

بێیەش له گرەی* لەشی و گیانی
دڵڕەش له ئەوینی ڕاستەقانی
*گره : پێوەندیدەر، گرێ، پیاوی خاوەن پلەوپایه.

کورد هێنده نه گێل و گێژ و کاسن
داخم ئەوه بێکەسن، کەساسن

ژیر و به دڵن گەلێک دەزانن
بێ خێوییه بێ سەر و زمانن

بۆ مەش که هەبایه خێو و سەردار
بەخشنده و ژیر و زیت و وشیار

ژیری و هونەری به دڵ کڕیبا
ژەنگی له دڵی هەژار سڕیبا

من ئێسته له کۆڕی وێژەوانان
ئاڵام دەشەکا له عاسمانان

دەم خستەوه ژین مەلای جزیری
پێم زیندوو دەبوو عەلی حەریری

وا شاد ئەبوو پێم فەقیهی تەیران
گیانی به فڕین دەهاته سەیران

چ بکەم!! که گەلێ کەساده بازاڕ
کووتاڵەکه باشه ، نیمه کڕیار

پایەی هونەران به پاره بەنده
هەرکەس که هەژاره کاری گەنده

هەرکەس کە لە ڕێی دراو و قۆشە
سەرخۆشە نەخۆشە دڵپەرۆشە

زانستێ هەموو بدەی بە پووڵێ
پێت وانەبێ کەس دەسی بجووڵێ

کەس ناکا بە مەیتەری خۆ (جامی)
ڕاناگرێ بە نۆکەری ( نیزامـــی)

دیتمان کە جیهان وەها شێواوە
هەر جەنگ و هەرا لەسەر دراوە

ویستم کە ببم بە زێڕ دروستکەر
لێی کەوتمە کار و بۆم نەچۆ سەر

تا بۆم وەگەڕێ زیان لە نیوە
چاوم لە شتێکی دی بڕیوە

چون فێڵ و فەرەج نە پیشەمان بوو
بێ نانی بەشی هەمیشەمان بوو

دین ڕۆیی دراو نەهاتە بەر بار
خۆم داوەتە مسگەری* بە ناچار
*مسگەری : کاری سپی کردنەوەی ئەو دەفر و هەوڕەی کە لە مس ساز دەکرێن.

شێراوە بوو خستمە دەر مسی خۆم
وا پەلک و بنووس هەیە و نزا گۆم

پاڕانەوەکەم ڕچێکی* زانی
لەو ڕێگەوە گەیمە کامرانی
*ڕچ : ڕێگا، دەروو، بەستراو، مەییو.

ئەو پولە* ئەگەرچی پارە ناکا
تاڵایی ژیانێ چارە ناکا
*پول: پووڵی وردی کەم بایەخ.

بێ فێڵ و گەڕە* ئەگەرچی وردە
کرمانجییە خۆشەویستی کوردە
*گەڕ : تەشقەڵە، شلّتاغ، بەپێچ و پەنا .

ڕووسوورە مسی* مە خۆ نە زیوە
یان زێڕە بلێن کە نیو بە نیوە
*مس : جۆرە کانزایەکە ــ مسی مە: مسی ئێمە.

پووڵی* مە بە بێ نرخ مەزانە
هەر پارەیە سووکە بێ نیشانە
*پووڵ : پارە ، دراو ــ پووڵی مە : پارەی ئێمە ، دراوی ئێمە.

جوان بێ کچ و، کەس ئەوی نەخوازێ
ئەم هەش بەسەرە بەچی بنازێ

نووسراوی هەژار و بێ پەنایان
بێ باشە لە زاری پادشایان

بێ نرخە لەلای گەلێک لە ژیران
هێژایە لە کن گەلێک بە بیران

مەزنی مە کە ژیر و چاکەناسە
بۆم تێنەگەیەندرا چ باسە

ئەو میرە کە میرەزایە ناوی
سەرچاوەیی ژین و پیتە چاوی

تیشکی دڵی ڕەش وە ڕوون دەگێڕێ
پووڵێکی چرووک دەکاتە زێڕێ

سەد مس* بێ کە چاو بگێڕێ پێدا
سەرپاکی دەبن بە زێڕ لە جێدا
*مس : یەکێک لە کانزاکانە . Copper

گەر تووڕە بێ زل دەخاتە بەر دەست
دڵخۆش بێ بڵند دەکا شتی پەست

وەک دیل دەگرێ ئەوانی پاشان
وەک ڕووت بەرەڵا دەبن لە پاشان

هەر ڕۆژێ هەزار نەدار و بێ جێ
هەر تاوێ سەتی گەدا لە سەر ڕێ

گیرفان هەموو داخنن لە بەخشین
بۆ وانە نە لەمپەر و نە پەرژین

چاوێکی خشاندبا بە من دا
دەپسا ڕەگی بێکەسیم لە بن دا

ئەم گفتە هەموو دەبوونە هەڵبەست
وردەم وەکوو زێڕ دەچوو* دەم و دەست
*دەچوو: بایەخی دەبوو. وردەدراوەکەم بەیەخی دەچوەسەر .

چبکەم دڵی هێندە تێ خزاوە
جێگایەکی بۆ مە لێ نەماوە

ئەو خۆشییە بەس بەشی نەزانە
خوایە تەمەنی بدەی جوانە

****

## پێشەکییەک بۆ چیرۆک

مەیگێڕ لە دەسی مەدە هەلێکە
وەک گیانی نەمر مەیێکی تێکە

تا بەو مەیی گیان و دڵ بەخێوکەر
تاوێکی گەرم بکەین دڵ و سەر

مەیگێڕ بکە پیاڵە ئاوی شابوون *
ئەو ئاوە کە چاوی دڵ دەکا ڕوون
*شابوون: شاد بوون، سەرخۆشبوون، مەست بوون.

خاوێن کەرەوەی مژیی قڕێژم *
سەرخۆشکە دڵی نەزان و گێژم
*قڕێژ، کرێژ : ناخاوێن. پیس، چڵکن.

مەیگێڕ دە بە گەوهەرین پیاڵە
لەو شیلە ڕەوان و پاک و ئاڵە

یاقووتی تواوە لەعلی ئاوە
خۆشاوی دوڕ* و دوڕی* خۆشاوە
*دوڕ1: مرواریی درشت، ئاماژە بە گلووی ترێ.
*دوڕ2: خڵتە، بنکڕ.

ڕەنگخۆش و بەچێژ و خۆشبەرامە
دەنکێکی کەمە بزانە کامە ؟

دەنکێ دوڕی ڕووتی تێ بهاوێ
خۆدانەکی* ڕووتی وەک گوڵاوێ
*خۆدان ، خۆدانەک: دڵۆپەی ئارەقی لەش .

زوو زوو بدە دەستی مەی پەرستان
ئەو کۆڕی کە هێشتە دڵ لە دەستان *
*دڵ لە دست: هۆش لە سەرەخۆ، هێشتا سەرخۆش نەبوو.

تا پیاڵەیی دڵ بە مەی بکەن ڕەنگ
تا ساز و بە دڵ بێ بەزم و ئاهەنگ

مەپسێنەوە بیاندەرێ لە پەستا *
تا بێ بەش ئەبن لە هۆش و هەستا
*لە پەستا: پەیتاپەیتا، زووزوو. خێراخێرا.

لەو بەخششی زۆر و دوور لە هەژمار
بەشکوو لە دڵۆپێ ببمە بەشدار

گەشکەی مەیی شیلەداری بێ گەڕ *
خۆشاوی بەری ترێی ڕەزی تەڕ
*بێ گەڕ : بێ فێڵ، بێ گزی.

کارێکی بکاتە سەر دەروونم
هێزداری بکا دڵی زەبوونم

تیشکێ بکەوێتە گیانی تاریک
دڵ بێتە سەری خەیاڵی باریک

دا تیری هەناسە کایگەر بێ
بیرکم* بشکێنێ سەد چەپەر بێ
*بیرک : زرێبار، گۆل، زرێچە، دەریاچە.

چڵک و چەپەڵی لە دڵ دەرێنم
دەرچم وەکوو بولبولان بخوێنم

دڵمردنی بەس بێ هەستێ بفڕێ
با شەرمێ نەهێڵی پەردە بدڕێ

گۆرانیی و لاوکان ببێژێ
چێژێ لە ئەوینی خۆی بچێژێ

هاواری بخاته مێرگ و باخان
خونچان بدڕن بەرۆک و یاخان *
*یاخان : یخەی کراس، بەرۆک.ی کراس، ئیخەی کراس .

گوڵخونچە بپشکو ون لە چوقڵان *
بولبول بگرین لە داخی چقڵان *
*چوقڵ : دڕوو، دڕک ، دڕکەزی، دری . * چقڵ : دڕوو ، دڕک ،دڕکەزی، دری.

جار جار بخەنن لە خۆشی دیمەن
ئاونگ بپژێ لە دەشت و چیمەن

سوێسنە وەزمان بێ ، بێتە باسان
ڕزگاربێ لە خەوخەوی و لە تاسان

مەیگێڕ بدە پێم مەیێکی گوڵڕەنگ
سەنتوور چ نەڵێت و دەف نەدا دەنگ

کوێخا و گزیر بەڵان نەزانن
دەرکەین کوڵ و خەم ئەویش لەوانن

دەست ڕژدی مەکە تژی* کە دەفرم
ڕەنگێکی جیا بە خۆوە بگرم
*تژی : پڕ ــ تژیکردن : پڕ کردن ــ تژیکە : پڕکە

سەرخۆش ببم و بە خۆم بنازم
نیازم هەموو ئاشکرا بخوازم

مەستم کە نەکەی گەلێک نەزانم
بێ مەی گەڕێ* ناگەڕێ زمانم
*گەڕێ : خولێک، جارێک ، کەشەیەک، کەڕەتێک.

مەمهێڵە بەهۆش و هیچ نەبێژم
شێتم کە هەتا دوران بڕێژم

بێ پەردە و شاردوان *وەسەرخەم
گش ڕاز و نهێنییان وەدەرخەم
*شاردوان : شاراوەکان، نهێنییەکان، گومبووەکان.

بلوێر بێ دڵم بە داخ و سۆ بێ
وەک تووتی دەمم بە گفتوگۆ بێ

تێی هەڵکەمە لاوک و (سێگا)* و (دەشت) *
حەیران و قەتار و بەست و گوڵگەشت
*سێگا : ناوی دەزگایەکی موسیقی یە. ـ * دەشت : دەشتی : ناوی ئاوازێکی موسیقی یە .

بێ ورتە دڵم بناڵێ وەک چەنگ
پێ پەنجە و پت* بدا دەفم دەنگ
*پت : پیتکە، پیتەلێدان، پتەی پەنجە لە کاتی دەفەلێدان دا .

بێژێ* و کەوان بڵێت ڕوبابم
تۆ بمدەیە مەی دەبێ وەها بم
*بێژێ : سازژەن، گۆرانیبێژ .

لەو بەرز و بڵیند و لەو هەوایە
زوهرە لە هەوام بکا سەمایە

دڵ تەنگە، دە دەنگی زیر و بەم بێ
دڵداری لە لانی «زین» و «مەم» بێ

دەردی دڵی خۆم بێ لەم وتانە
«زین» و«مەم» ئەدی چ بن؟ بەهانە

وابکەم کە جیهانێ بێ و بنۆڕێ
دەژیەنمەوە «زین» و «مەم» لە گۆڕێ

لەو دووی لە ئەوین بە زام و بیمار
با خۆم بکەمە پزیشک و زانیار

با گەش بنەوە و بە خەم بڵێن بەس
ببنە نەمر و نەچن لەبیر کەس

داخی جگەری «مەم»ی گرفتار
ناخۆشیی ژینی «زین»ی دڵدار

«مەم» لاوی لە پیسی و گوناهـ دوور
«زین»ئەو کچی وا بە شەرم و ڕووسوور

دەیکەم بە شتێکی وا تەڕ و خۆش
هەرگیز لە جیهان نەبن فەرامۆش

دڵبەر بۆ «مەم»ێ بکەونە شینێ
دڵدار بخەن بە دەردی «زین»ێ

هاودەرد بوونیش شتێکی خۆشە
بێ دەرد بگرن کەنار و گۆشە

لام وایە ئەوانی ڕاست و پاکن
دڵڕوونن و ژیر و بیر ڕووناکن

هەڵبەستێ وەها هەچی ببینێ
بۆ «خانی» دەنێرێ ئافەرینێ

هەرکەس کە خودای بڵند و پەستی
پێی داوە بەشێک لە خۆشەویستی

با بێن ببیەن خۆیان لەبیر کەن
کۆرپەی دڵی هێندە پێوە ژیر کەن

بیکا بڕێ گوێی گیانی لێ پڕ
ماڵیاوا لە دڵ بکەن دوو سێ بڕ

هیوامە لە ڕاست و بێ گرێیان
نەبیەن لە چنۆک و زۆربڵێیان

ئەم نامە کە خاوە یان لەباوە
سەد ڕەنجی لە ڕێگە دا دراوە

ساوایە، مناڵە، شیرنەمشتوو
تازەبەرە، تازەپێگەیشتوو

پێش من دەسی هیچ کەسی نەدیوە
میوەی ڕەزی خۆمە نەمدزیوە

ئەو میوەیە خۆشە یانە تاڵە
دڵبەندی منە وەکوو مناڵە

هیوامە بوێژی هاوزمانم
تەوسان نەگرێتە ڕۆڵەکانم

ئەو میوە کە وشکە، تفتە، تڵخە*
خۆ کوردییە زۆر لەلام بەنرخە
*تڵخ : تاڵ . ـ تڵخ : چەشنە ڕەنگێکە بەرامبەری تۆخ.

ئەو کۆرپە دەڵێی نە نازەنینە
چون نۆبەرەمانە خوێن شیرینە

میوەی منە، خۆشە، بۆی نەماوم
کۆرپەی منە بۆتە چاوی چاوم

خشڵ و جل و یار و زێڕ و زەمبەر
نەمخواستەوە هی منن سەر و بەر

ناوئاخن و پیت و تیپ بەجارێک
ڕیزێکی وشێکی یان وتارێک

هی خۆمە لە کەس نەهاتە چەنگم
خۆم خاوەنی کەسم و خێوی ڕەنگم

ئەم گفتی شیرین و بیری سەد جور
پاکی کچە، تازەبووک و ڕووسوور

خوایە مەدە دەستی پیاوی لاسار
ئەو دڵبەری شۆخ و شەنگ و نازار

پاڕانەوەمە لە خوێندەواران
بێهوودە نەکەوەمە لێو و زاران

بۆ گاڵتە نەڵێن ئەم و ئەوی بوو
با چاکی بکەن ئەگەر کەمی بوو

چی پاکژ و چاکە پەردەپۆشن
هەر دڵ چەپەڵن کە گەڕ فرۆشن

هیوام ئەوەیە لە مەرد و ژیران
بۆ گەپ نەبمە نیشانەی تیران

کرمێکم و، هاوریشم لیکاوم *
خۆڕستم و خۆم لە خۆم ڕواوم
*لیکاو : ئاوی ڕەوانبووی دەم و زاری ئینسان و هێندە ئاژەڵێک .

کوردم لە چیا و کەژ و نزاری
چەند گفت و وشێکی کوردەواری

لێم وەربگرن بە سینەیی ڕوون
لێمی نەگرن چ خۆشە خۆش بوون

دڵپڕ لە ڕقیش کە گوێ بدێرن
چییان لێ دێ کەمایەسیم وەشێرن

ئابڕووی بوێژی با نەڕێژن
گەر دەکرێ شتێکی باش ببێژن

بۆم پینە بکەن هەڵەی زمانم
با بێننەوە بیر منیش لەوانم

****

## پەسنی میری بۆتان و دوو خوشکە جوانەکانی

ڕەنگڕێژی پەرانی مێژوو زانی
دەنگبێژی جیهانی خۆشخوانی

وا نەخشی دەکرد بە ڕەنگی چەند جۆر
وای بۆ دەگوتم بە بەند و باڵۆر*
*بەند و بالۆر : چەشنێک لە گوارانییەکانی کوردەوارییە،
کە دوو کەس یان چەند کەس بۆ یەکتری دەگێڕنەوە.

میرێ هەبوو ڕۆژگای پێشوو
دڵخوازی بەچی هەبوو، هەمووی بوو

سەرداری گەلێ گەلی زل و ورد
تۆوی عەرەبان و سەروەری کورد

پاتەختی (جزیر) و بەختی چا بوو
زۆر دەستی گوشاد و شاد و شا بوو

ڕۆم و عەرەب و عەجەم لە فەرمان
ناوبانگی هەبوو بە میری (بۆتان)

خاڵندی دەگرتەوە لە باپیر
پشت پشتی هەموو زل و جەهانگیر

عاسمان لەوی بێ ترس نەمابوو
شیرێکی* خودا بوو دەرکشا بوو
*شیر : شمشێر .

زیانی نە دەدین و بێ بەزین بوو
ناویشی (ئەمیری زینەدین)بوو

بۆ جەنگێ کە تەختی خوانی زین بوو
ئیتر نە بەزین و دابەزین بوو

ئازایەتی ویت *دەویست بناسی
ناوبانگی گەیشتە مانگ و ماسی
*ویت : ئەوت ، ئەویت ، هەر ئەوت .

خواناسی ئەویش بە دەنگ و ناو بوو
بۆ هەر دوو جیهان خودا پێداو بوو

حاتەم لە دەهندەیی بەزی بوو
ڕۆستەم هەڕەشێکی وی بەسی بوو

ژیری و هونەر و بەکاری و دین
بەردە و بگرەی بە داد و بەخشین

دەتگوت کە بە بەژنی ئەو بڕا بوو
تا ئەو بوو ، بەشی کەسێ نەمابوو

سەد جۆرە گەواهێرات و یاقووت
ئەڵماس و پیرۆزە، لاڵ* و زمڕووت
*لاڵ : لەعل ، بەردێکی بە نرخە، چەند ڕەنگی هەیە: سووری تۆخ ، سووری ئاماڵ بە زەرد .

داکرابوو* بە کۆ لە هەر شوێنێک
دارماڵ بوو هەموو کون و کەلێنێک
*داکرا بوو : ڕۆ کرابوو، ڕژابوویە سەر یەک .

پێت وابوو کە هەندەر* و بەهەشتە
کیژۆڵە تژی هەموو فریشتە
*هەندەر : دەرەوە، دەرەوەی وڵات.

هێند سادە و لووسکە* نۆکەری بوو
ژوور و دەری هەر پڕی پەری بوو
*لووسکە : تاس و لووس، شۆخ و ڕەعنا.

لەو باغە دوو نەونەمام ڕوا بوون
بێ وێنە لەناو بەهەشتی خوا بوون

سوورگوڵ دوو لە پنجە شا ڕوا بوو
دوو خوشکی خوشێک و یەک برا بوو

دەت ڕوانی ئەگەر لەسەر ڕوانگا
دوو ڕۆژت ئەدی بە دەوری مانگا *
*مانگا : مانگ دا.

یەک پیاوی دەکوشت بە چاوی مەستی
ئەو ناوی نرابوو (خاتووئەستی(

ئیدی* لە دڵ و هەناوی میر بوو
ئەو ناوی لە ناوی میر بوو
*ئیدی : ئەوی دی، ئەوی تریان.

خۆت ڕەنگە بزانی ناوی (زین) بوو
بەس دیتنی (زین)ێ دڵتەزێن بوو

یەک ناوی جوانی کەوتە شاران
گیانێ بوو ئیتر لە کۆڕی یاران

یەک گەندەمیی و یەکێ زەری* بوو
یەک چەشنی فریشتە یەک پەری بوو
*زەری : جوانی سپی پێستی ئاماڵ زەرد.

کەنگێ پەریی و فریشتە وا بوون
ئەم جووتە لە ڕۆشنی خودا بوون

هەرگیز کەسێ جوانی وای نەدیبوو
نەمزانی هەوێنی وان لە چی بوو

لاجانگ وەکوو زێو چەناگە وەک سێو
ئاونگی لە ئاوی ژین لە سەر لێو

سەرکوڵمە وەکی پەڕی گوڵی ئاڵ
چێنرابوو تیا دەنک دەنک خاڵ

تەنگی دەم و دەنگی پێکەنینی
بردیان بڕەوی بتانی چینی

ڕەشماری کەزێ لە بەژن و باڵا
وەک هەورەڕەشێ لە ڕۆژ دەهاڵا

چاوێنی* پەڕێن بوو دێری سەر ڕوو
چاڵی چەنەگەی پڕی لە جادوو
*چاوێنی پەڕێن : چاو و زار پەڕێن، لابەری چاوپێهەڵێنان .

بۆنخۆشی وەنەوشە و گوڵی ئاڵ
پشکۆ بوو لە چوقڵی سەوڵ* و شمشاڵ
*سەوڵ: داری سەرو، گوڵی پۆپە کەڵەشێرە.

سوورگوڵ لە سەری لکان ڕووا بوو
تاتای موو بە سەر یەکا ڕژابوو

ڕەشخاڵ وەکوو بەردی حاجییان بوو
ئەو کۆشکە حەجی ئەوان دەمان بوو

ئەبرۆ چ کەوانی بێ گرێ و ڕێک
پەیکانی بژانگ، چ تیری دڵپێک

نازک بە لەش و هەڵۆ بە چاوان
تۆقی بوو* دڵی دڵان لە تاوان
*تۆقی بوو : دڵی لاوان لە بینینیان تۆقی بوو.

دایان نا ئەوانی مووقەڵێشن
هەر گۆشەیی چاوە، گیان دەکێشن

توێڵی* سپی پەرچەمی ڕەش و کۆ
وەک باڵی پەری لە سووچی ئاسۆ
*توێڵ : تەوێڵ ، ناوچاوان .

ڕۆژ کارەکەرێکی ناوچەوان بوو
لە جوانی بە پاس و دەرکەوان بوو

کێ کوڵمی دەدیتن و بنانگوێ
مردن بوو پەنای دەبردە بەر کوێ

گەردن وەکوو قومقمۆکی بادە
پڕ بێ لە گوڵاوی ڕوون و سادە

هەرکەس کە ببینێ پێی دەزانێ
سەرچاوەیی ئاوەکەی ژیانێ

سەرپەنجە و نەینوکی خەناوی
خوێنیان دەڕژا دڵان لە تاوی

دینی* بەر و کەمبەری شل و مل
چاوی گەش و ڕوون دەکرد بەبێ کل
*دینی : دیتنی ، سەیر و ڕوانینی، تەماشاکردنی.

هەڵیان کە دەماڵی قۆڵ و بازن
جێدار* بوو لە سەر جیهان بنازن
*جێدار : شیاو . جێدار بوو : شیاوی ئەمە بوون کە...

ئەو دوو گوڵە شۆخ و شەنگە جوانە
هاتبوونە جیهان هەواڵ دووانە

هەرچەندە کە «ئەستی» نازەنین بوو
«زین» زۆرتری خوشکی، خوێن شیرین بوو

هی وان بوو جوانی گشتی شەشدانگ
ئەستێرە بوو«ئەستی»، «زین» وەکی مانگ

ئەستی وەکوو مانگ و زین وەکوو خۆر
چاوپیس و چنۆکی پێ دەبوو کۆر

ئەو هەر دوو وەکوو دوو شەوچراخان
کاتێ کە دەچوونە سەیری باخان

گیاندار دەچوو گیانیان بە تاڵان
گیا وو گژ و دار و بەرد دەناڵان

پەرچەم شەوەڕەش لە دەوری لاجانگ
شمشێری برۆ لە سەر لەتی مانگ

پەرچووکە* لەسەر هەنێ بنەخشێ
کێ بێ دڵ و گیانی پێ نەبەخشێ
*پەرچووکە : پرچ و قژی هۆندراوەوەی دەوری نێوچاوان .

ڕازانەوەیان بە زێڕ و گەوهەر
لەرزانە و گۆبەرۆک و کەمبەر

ئەو لەنجەیی کۆتری بە سەد ناز
لەو جووتی بەژن نەمامی چاوباز

پۆل پۆل کچی شۆخ لە دەور و بەریان
پیر، بۆ دڵ و دینی خۆ دەگریان

خواناس و مەلا و بەناو و بێ ناو
خونکارە، هەژارە، پیرە، یان لاو

کوانێ کە دڵی نەچێتە جوانی
نرخی کە نەزانی زۆر نەزانی

هێندێک دڵ و دین دەدەن بە تێکوڵ *
هێندێ بە خودای چڵ و گوڵ و دڵ
*تێکوڵ : مەبەست لە دەروەی شت.

دۆست هەر یەکە بەردە شێوی شێوان
وەک تێکوڵ و کاکڵێکە* نێوان
*کاکڵ : نێوەرووکەی شت، دەروونی شت.

****

## باسی جوانیی ئەستی و «زین»ێ

هێندەی کە خودای بە تاق و تەنیا
پووڵ و شمەکی ڕژاندە دنیا

قەیسەر هەچی* بووی لە زێڕ و زێوان
زۆرتر لە بژاردن و لە پێوان
*هەچی : هەرچی ، هەر شتێک.

هەڵماس و گەواهێراتی قاقان
تا دەچتە نەقێمەکەی سلێمان

چی نرخی گرانە پێی دەزانی
ناهێنێ کەمووسکەیەک لە جوانی

ئەو جوانی لە ڕووی «ستی» و «زین»ێ
دەریا بوو لە ئاگری ئەوینێ

کاتێ کە دەکەوتە سەر شەپۆلان
سەرڕێژی دەکرد لە گرد و گۆلان

بۆ هەرچی پڕیشکی خۆی دەپڕژاند
سەد گیانی دەمەو* لە حاست دەبرژاند
*دەمەو : گورجێک ، بەخێرایی ، دەمەودەست، لە چاوترووکانیکدا .

دارا و نەدار و کۆک، ڕەش و ڕووت
ئەو دوانە کە هاتبان دەیان گوت

جوان گەیونە یەکدی* مانگ و خۆرن
کڕیار ئەوە بۆیە هێندە زۆرن
*یەکدی : یەکتر، لای یەکتر ـ گەیونە یەکدی: گەیونەتە لای یەک.

ڕاوکەر لە ڕێگەی ئەم ئاسکانە
دڵبەستەیی ئەم دوو ناسکانە

گەر بەور و پڵنگ و نێرە شێر بوو
هەر ڕۆژی بەرێ بە ناڵە فێر بوو

گریان بوو، هەرا بوو، ڕۆژ ئەگەر شەو
هەرگیز نەدەهاتە خەونەوە خەو

هەر جوانییە بێ بن و کەنارە
دڵداری گەلێکە بێ ژمارە

دڵدار هەیە مەردە گیان دەبازێ
ئیواش هەیە وردە ماچ دەخوازێ

یەک یاری دەوێ لە بازم و یاری
یەک گیانی شیرین دەدا بە یاری

لێو مژتنە بۆ «ستی»ی و «تاژدین»
خۆ کوژتنە دێتە ڕێی مەم و زین

****

## دۆستایەتیی مەم و تاژدین

با بێینەوە سەر وتارەکەی پێش
سەوداسەری دڵ برینی پڕ ئێش

هەرچەندە کە زۆر و بێ ژمار بوون
گچکە و زل ، خوێڕیی و بەکار بوون

لەو کۆشک و سەرایەدا بوو سەد لاو
خوێن شیرن و ڕێک و پێک و بەرچاو

هەریەک بە جوانی ڕۆژی ڕووناک
ڕووخۆش و لەبار و دەست و دڵ پاک

وەک مانگی لە چاردە، بێیە ڕاستی
مانگ زەرد بوو، کە یەک دەهاتە حاستی

سەوداسەری* پیشەیان بوو گشتی
بەستبوونی ئەوین بە داوی گشتی
*سەوداسەری : دڵداری ، ئاشقێتی، ئەڤینداری و ماڵوێرانی .

یەک ڕازی دڵی یەکی دەزانی
گشتی دڵی چوو بوە سەر زمانی*
*واتە هەر هەموو کەس باسی ئەڤینداریی بە زمانی دا دەگەڕا.

سەودا لە دڵا نەوەک بە دیتن
ئەم جۆرە ئەوینە کەم بە پیتن

تێیدا بوو لەوانە تازە لاوێک
سەردەستەیی گشت و خێوی ناوێک

تاژدین بوو، بەڵام چتۆ *جوانێک!
گوودەرزی جیهان و پاڵەوانێک
*چتۆ : چ چەشنێک، چ تەرزێک، لە چ چەشنێک.

میر کامە ڕەگەز بوو ئەو لەوان بوو
سەر کۆمەڵ و گەورە و گران بوو

ئەسکەندەری ناو بوو بابی جوامێر
بیستوومە عەرەب پێیان دەگوت شێر

چون ڕۆژی هەرا* بە تاقە سواری
دەیتوانی بەرێ سەری هەزاری
*ڕۆژی هەرا : ڕۆژی شەڕ، دەمی تەنگانە و قەیران.

تاژدین دوو برای هەبوو، کوا وەکی وان؟
پێمیردی* خودا دەگەڵ چەکی وان
*پێمێرد : عیزڕائیل، کاربەدەستی خودا بۆ گیانکێشانی خەڵک.

ئازایی لە پاش ئەوان درۆ بوو
یەک «عارف»ی ناو بوو یەک «چەکۆ» بوو

تاژدین لەسەر ئەو هەموو نەمامان
لە برای و لە خزم و خاڵ و مامان

لاوێکی تری کەس و برا بوو
چم وت ؟ نە برا بوو شەو چرا بوو

هەر ڕۆژێ کە ئەو برای نەدیبوو
وابزانە بە شەو چرای نەدیبوو

دنیا بوو لە بەر دوو چاوی تاریک
تای کرژی* دڵی پساو و باریک
*کرژ : توند بادراو،قرژ و وێکهاتوو.

هاواڵی دەمانی خۆش و خەم بوو
دڵبەندی خەمان و ناوی (مەم) بوو

ئەو چۆن بوو «مەم»یش لە ڕاستی وا بوو
تاژدین نەبێ چی لەبیر نەمابوو

مەم ڕۆڵەیی نووسەرێکی میر بوو
تاژدین کوڕی گەورەترین وەزیر بوو

هەڵیان نەدەکرد بەبێ یەک و دوو
جیاوازی بە دڵ نەبوو، بە لەش بوو

ئەم جووتە بە جۆرێ دڵ لە یەکبوون
دەتوت کە ببوونە لەیل و مەجنوون

زۆر پێکەوە هۆگرێکی پاک بوون
جووت بوون و لە خۆشەویستی تاک بوون

بۆ یەکدی ببوونە دۆستی گیانی
دەرچوو لە زمانیی و لە نانی

با وابێ هەواڵەتی و برایی
بێهوودەیە دەمدەمی و هەوایی

هاسان نییە دۆستی، گرانە
دۆستایەتی و ئەمەگ برانە

گەر دڵ بە گومان، گومان دەبەی خۆت
دۆستی مەکە زۆر گران دەبێ بۆت

****

# جەژنی نەوەرۆز

بڕوانە خودای بڵند و زانا
چی کردووە لە هەرد و عاسمانا

بێ مشتە و ڕەندە، بێ گەز و گاز
وەستایەکە ناگەرەکییە *ئامراز
*ناگەرەکییە = گەرەکی نییە.

یەک گەورە و یەک درێژ و یەک خڕ
واڵا* و بە نێو و نیوە و پڕڕ
*واڵا = بەتاڵ ، بێ ناوک و ناوەرۆک.

دەرکەوتووە گش لە کارگای ئەو
سەرسووڕڕە جیهان لە بارەگای ئەو

سەیریش ئەوە گشتیان لە کارن
هێندێکی پیادە، هێند سوارن

هێندێ بە هەران و هێندێ وستن
دەستێک پەلەکار* و هێندێ سستن
*پەلەکار = خێرا، بە دەست و برد، چالاک.

یەک دێت و یەکێ دەچێت و، دەستێ*
هەروا لە گەڕە و هەشە دەوەستێ
*دەستێ = دەستەیەک ، تاقمێک.

هێندێکی دەنووسێ و هێندێ وەستان
یەک سەربڕە، یەک بوێژی بەستان

یەک خەم دەڕەوێنێ ، یەک کزوڵکە و
یەک ڕۆژ دەپەرەستێ، یەک چرای شەو

هێندێکی بە چەشنی «زین»ی نازار*
هێندێ وەکوو (مەم) دەبن گرفتار
*نازار = نازدار

سەرپاکی بە ڕۆشنی و جوانن
هێند شاهن و هێند وەزیری وانن

ئەستێرەیی هێندێ بۆیە ناردوون
هێنانی بەهاری پێ سپاردوون

ساڵ تازە دەبێتەوە کە هاتن
سەرما دەکەوێتە سەر هەڵاتن

گێڕایەوە بۆم پیاوەکی پیر
پیرێکی بەبیر و زیت و دڵ ژیر

گۆیا کە لە ڕۆژگاری پێشین...
جەنگە* و هەڕەتێ* کە دەر دەبێ شین
*جەنگە و هەڕەت = سەردەم، کات ، وەخت.

واتا کە دەبوو بە ڕۆژی سەر ساڵ
هەرکەس دەرئەچوونە دەشت و بەرپاڵ*
*بەرپاڵ = بنار و قەدی کێو.

کیژ و کوڕ و لاو و کۆنە ساڵان
باپیر و نەنک لە گەڵ مناڵان

جێژنی هەرە زل *بوو جێژنی نەورۆز
تا پێوە بنووسێ جێژنی نەورۆز
*زل = گەورە ، مەزن.

تاکی نەدەمایەوە لە ناو ماڵ
دەیدا لە دەر و لە چۆڵگە بای باڵ*
*بای باڵ دان = جووڵانەوە ، لە گۆشەنشینی و تەریکبوون هاتنە دەر.

نەخوازە کوڕ و کچی گەیشتوو
چی هێشتە* لە یەکدی* چێژ نەچێشتوو
*چی هێشتە = ئەوەی کە تا ئێستا . * لە یەکدی = لە یەکتر.

ڕازاوە لە خشڵ و بەرگی باشا
چاو تێر بوو هەمووی لەبەر تەماشا

هەر لاوێ لە بیری خواستنایە
با کیژێ ببینێ چی تی یایە ؟

ڕۆژێ کە دەچوونە گەشتی دەشتێ
دەشت مشت* بوو لە میوەیی بەهەشتێ
*مشت = پڕ ، پڕاوپڕ ، تژی .

هەر جوان بوو لە یەک دەبوونە کڕیار
سەودا بە دڵ و بە چاوە بڕیار

هەر تاک بوو لە جووتی چاو دەگێڕا
تاک بۆی دەچوو جووت دەهات لەوێڕا

****

## سەیرانی جێژن و دۆست گرتن

دیسان کە نواندی جێژنی نەورۆز
لە گوێرەیی ڕێ و شوێنی پیرۆز

گش ورد و درشتی ناو «جزیر»ێ
بیگرە لە شوانێ تا وەزیرێ

شاری و ڕەمەکی و گزیر و هەرچی
تێیدا بوو شڕە و گەڕۆک و چەرچی

پۆل پۆل دەگەڕان لە کێو و دەشتێ
خەمیان دەپەڕاند لە سەیر و گەشتێ

هێندێک بە پێیا دەچوونە باخان
سواران دەگەڕان لە کێو و شاخان

هێندێکی بە یەک یەک و جودایی
دەستێکی بە گەڵ بە دڵ تەبایی

هێند هاتبوو خانم و ژنی جوان
دنیا پڕی گوڵ بوو لە بەر وان

تێی هاتبوو هێند پەری و فریشتە
تا وابێ بەهەشتی گەورە دەشتە

کیژۆڵە و لاو ڕوو بە خاڵان
لێو قەند و مەمک دوو لیمۆ کاڵان

خونچە دەم و ڕووبەخاڵ و خوێن سووک
لاوی تەڕ و تازە ، لووس و بێ تووک

کڕیار و فرۆش هەموو جوان بوون
نرخ و بەنرخ لە سەر ڕووان بوون

نازداری دەهاتە باری سەودا
نەک کۆنە پەڕۆ و کەڵاف و هەودا

جوان چاکی دەهاتە ناو تەرازوو
چاو کاری دەکرد نە زۆری بازوو

ئەو ڕۆژە دەبوە کە جێژنی سەر ساڵ
منداڵی دەساڵ و پیری سەد ساڵ

خۆیان نەدەهاتە بیر چە جارێ
ئاهەنگ و بەزم بوو تا ئێوارێ

****

## خۆ گۆڕینی تاژدین و مەم

پڕشنگی چرای لە گومبەزی شین
کردی دەمێ خاکە لێوە ڕەنگین

ڕێ و شوێنی گەلێک لەمێژ و زوو بوو
حەو* ڕۆژەیی جێژنە بۆ پشوو بوو
*حەو = حەوت ، مەبەست حەوت ڕۆژی هەفتەیە.

هەر ڕێگە درا بە کیژ و لاوان
دانێکی* نەمان لە ماڵی باوان
*دانێک = نیوە ڕۆژێک.

کچ دەچوە دەرێ دڵێکی ببڕێ
کوڕ دەچوە بەرێ* گوڵێکی بکڕێ
*بەرێ = پێش و پێشتر.

(تاژدین) و (مەم) ئەو دوو شێر دڕانە
پۆشیان شمەک و جلی کچانە

هەوری لە ملان بە ئۆیە دەسماڵ
تافتە کوڵەجە کراس و لێو ئاڵ

کاکۆڵ بوو، ببوو بە بسک و پەرچەم
هەر دوو کچی قۆز ئەگەر ببا مەم! *
*مەم = مەمک . ئەگەر مەمکیان بوویایە.

هەربۆیە بوو کەس ئەوان نەناسێ
باش گوێ دەنە بەزم و دەنگ و باسێ

بیان هێڵە بە بەرگی نازەنینان
با بچینەوە لای «ستی «و «زینـ» ـ ان
****

## گرفتار بوونیان بە دەرد و داوی ئەوینەوە

هەردووک دەگەڕان بە بەرگی گۆڕاو
ڕامان لە شتێکی سەیر و ناکاو

دیتیان لە پڕێ لە هەر دەرێکا
هەر کووچە و، کۆشک و پەنجەرێکا

چەند تازە جوان لە چەشنی سەروان
پارچەی هەموو جۆر و ڕەنگ لە بەردان

پۆل پۆل کچ و لاو بە دەستە دەستە
هێندەش ئەوە پیری دار بە دەستە

هێند زگ زل و هێندی لات و لووتن
هێند پۆشتە و هێندی ڕووت و قووتن

هێندێکی گران و هێندێ سووکن
هێندێکی زەلام و هێندی چووکن

یەک کاڵە لەپێ، یەکێکە پێخواس
یەک قیژە دەکا، یەکێ وڕ و کاس

یەک سەقزنە، یەکێک بە کاکۆڵ
یەک خۆڵ وەسەرە، یەکێ لە سەر خۆڵ

پیتۆڵە* یەکێک، یەکێک بە تیتۆڵ*
یەک بۆڵە دەکات و یەک ڕووەو چۆڵ
*پیتۆڵ = زۆر زان. بە تیتۆڵ = جلک شڕ.

مرکیوە* یەکێ، یەکێ لەسەر جۆش
هێندێکی خەواڵوو هێندێ سەرخۆش
*مرکێو = دامرکاو، هێدی، هێمن، بێدەنگ...

هێندێ لە بڵند و هێند لە چاڵن
هەر یەک لە هەوایەکی دەناڵن

گوێ پڕ بوو لە ناڵەیی بەزامان
هەرتک* بە وردی سەرێکی ڕامان
*هەرتک = هەر دوو، هەردووکیان .

تاژدین لە یەکێکی پیری پرسی
لالۆ چییە ئەو هەرا و مەترسی ؟

پێی وت کچەکەم دوو نۆ نەمام کوڕ
ئەمڕۆ لەمە بوونە میری سەر بڕ

هەرکەس کە ببینێ ئەم دوو لاوە
ئیتر ئەمە هۆشی نا بەلاوە

وتیان ئەتۆ دیتن؟ ئەو چ ڕەنگن ؟
فەرمووی بەڵێ دوو کوڕی چەلەنگن

گوتیان کە هەیانە تیر و خەنجەر ؟
یان شیری شەتەک دراو لە کەمبەر؟

فەرمووی کە بە سیلە چاو و ئاوڕ
لەم کۆمەڵە بوونە جەرگ و دڵ بڕ

لەو پرس و وەرامە دا لە ناکاو
دڵ ترسی لەچی بوو هاتە بەر چاو

بێ وێنە دو کوڕ، دوو تازە لاون
سێیەنگی برۆن و مەستە چاون

یەک ڕەنگ و شمەک گەلێ تەیارن
بێگانە و ڕەنگ نەناس دیارن

باڵا کەڵەگەت نیان و نەرمن
تا چاو دەیەوێ بە ناز و شەرمن

هەر لەو جێ کە چاو کەوت بە چاوان
یەکجێ فڕی هۆش و دڵ لە تاوان

فرمێسک ئەڕژان لە چاوی تاژدین
مەم بوو بە بەفر لە تاوی هاوین

بەو تاوی جوانی تاس و گێژ بوون
بێ هۆش لە چەقی ڕێگا درێژ بوون

ئەو هەر دوو کوڕی بەناز و نیمناز
دیتن دوو پەری شەهێنی چاو باز

ڕۆژن وەکوو مانگێ ڕەنگ زەردن
دڵدار و شکاوی بەردی دەردن

وەک تازە کوژاو بە هەڵبڵۆقن*
بەو تینی ئەوینە هەڵدەچۆقن
*بە هەڵبڵۆق = بە لینگەفرتە.

دوو سوارە بەزینە* سەر نێچیران
دیتیانن و کەوتنە چاڵی بیران
*بەزینە = دابەزین، لە ئەسپ هاتنەخوار.

زانیان کە نێچیرەکان قەڵەو بوون
باز گیرە* لە داو، نە زەڕەکەو* بوون
*بازگیرە = هەڵۆ لە داو کەوتووە * زەڕەکەو = زڕەکەو.

وێستان و ڕوانییان بە گەرمی
دڵیان کوڵی* کەوتنە باری نەرمی
*دڵیان کوڵی = بەزەیی بە دڵیان داهات.

لەو جوانییە بەم دوو ئاسکانە
سووتا دڵی ئەم دوو ناسکانە

دڵیان بە دڵی یەک ئاشنا بوون
دڵ ئاوێنە بوون و ڕوو نوما بوون

دڵ بوونە هەواڵ لە سووچی چاوا
کۆچ کردە بوو دوودڵی* لە ناوا
*دوودڵی = ڕاڕایی ، خاوەخاو، بچم و نەچم .

خوا هێندی لە خۆشەویستی پێدان
دڵداری وەهای لە یەک گرێ دان

دەتگووت کە چوار گیانە یەک لەش
گیانێکە لە چوار لەشان بوە بەش

ڕاستت دەوێ هەر یەکن لەش و گیان
ڕۆژی بەرێ* یەکیەتی بوو بە بەشیان
*ڕۆژی بەرێ = هەر لە سەرەتاوە، لە ئەزەلەوە.

گیانان هەموو پێکەوە تەبا بوون
کاتێ کە لەبارەگای خودا بوون

ناردوونیەتە گرتووخانەکەی لەش
ئەو ڕۆژە جیا وەبوون بە دوو بەش

هێشتا بڕێ مرچ و مۆڕ و گرژن
ئەو تیرەیە ناو نران بە دوژمن

دەستێکی لەیەکدی بوونە دڵدار
ئەو دەستی کەوت ژیانی ڕزگار

وێ ڕۆژێ* لە گوێرەی ئەم سرشتە
تێکەڵ بوو دڵی دوو جووت فریشتە
*وێ ڕۆژێ = ئەو ڕۆژە ، هەر ئەوێ ڕۆژێ.

کاتێ کە گەیینە سەر دوو زامار
ئەو دوو کوڕی دیدە مەستی نازار

دوو گوڵ دڵی دایە دووی وەکوو گوڵ
پشکووت گوڵی دڵ، ڕژا کوڵی دڵ

بوو ڕانی ستێ سەرینی تاژدین
جێی گرت سەری مەم لە باوەشی زین

لێویان دەخشاند بە کوڵم و خاڵا
چاو تێر نە دەبوون لە بەژن و باڵا

وتیان دەبێ ئەم کچانە چی بن
تۆ بڵێی کە فریشتە یان پەری بن!

ئەو میوە لە باخی کێ چناون
ئەو گوڵ لە چ گوڵبنێ ڕواون
*چناو = چندراو ، چێندراو.

دوو تازە نەمامی کام دەراون
ڕەگیان بە گوڵاوێ ئاو دراون

فرمێسکێ لە چاو خزی لەسەر سنگ
لەو دوو گوڵی سیسە بوونە ئاونگ

سەرخۆشی ئەوین بە بۆنی وا خۆش
پێم سەیرە کە هیچ نەهاتنەوە هۆش

تا بینە هەواڵی دیدە مەستان
ئەنگوستیلە دەرخران لە دەستان

گۆڕیاننەوە کلکەوانەیی* خۆ
نایانەوە داو و دانەیی خۆ
*کلک = قامک ... کلکەوانە= قامکەوانە، ئەنگوستیلە، هەنگوسیلە .

هەڵماسی نقێم* دران بە شووشە
کار هەر بە دڵە، شتی دی پووشە
*هەڵماسی نەقیم = هەنگوستیلەی نەقیم لە ئەڵماس.

شیرنایەتی جێژنە بوو بە تاڵی
قاڵ بوون بە ئەوین، بەسە مناڵی!

تاوپەڕ بوو و بەجێ نەما لە وێمان*
خۆش ڕۆیین و دووی نەخۆش بەجێمان
*لەویمان = هەر لەو جیگایە جی مان.

تاژدین و مەم ـ ی بە دڵ بریندار
پێوەندی دوو ئاسکی ناسک و نازار

وشیارەوە بوون شەوە، شەوەزەنگ
بەس ناڵەیی دڵ نەبێ نییە دەنگ

دوو ڕۆژی بە ڕۆژ ، ون و نەدیون
وەک مانگە شەوێکی ڕەنگ پەڕیون

بێ هێز و کز و سڕ و کز و تاس
بێ تین و توان ، هڕ* و وڕ* و کاس
*هڕ = گێژ، کاس . * وڕ = گێژ، کاس .

لاواز و زەبوون و نیوە مردوو
بە شلێک و دڵێکی جەردە بردوو

تا گەینەوە ماڵ بە لارە لارە
لێی بوونە تخێڵ بە جەرگی پارە

نه زمان و نه سەر، نه خواردن و خەو
لایان وەکوو یەک بوو ڕۆژ لەگەڵ شەو

****

## دەردی دڵ

ئەو باز و شەهێنی پەڕ پڕووزاو
(تاژدین) و «مەم»ی دوو دیدە دڕاو

بۆ پۆڕ و کەوان دەچوونە ڕاوێ
چۆن ڕاوێ بە جووتە کەوتنە داوێ

لێی دان لەپڕ و ناکاو بریسکێ
سووتان نەبوو هەڵبدەن هەنیسکێ

حەو ڕۆژەیی جێژنە هات و چوو خۆش
ئەم جووتە لە جێ نەخۆش و بێهۆش

چەند ڕۆژی تریشی هات بە شوێنا
سەریان کە لەسەر سەرین هەڵێنا

لێڵایی لە چاو، ڕەنگ بزڕکاو
تارمایی نەبێ نەهاتە بەر چاو

تاژدین بە «مەم»ی دەگووت ئەتۆ کێی ؟
(مەم) سڵ بوو پتر لە ڕاستی هاوڕێی

دەرمان و بزیشک و نووشت و یاسین
تا هاتنەوە سەر یەک و دوو ناسین

خۆیان دی لە پێچی پاچەبەندییان
پێچراو لەش و، گیان بە چەند کەمەندان

بێ چاو و، بێ دان و، ئاو و، بێ تاو
بێ باڵ و لە دڵ برین و لەش خاو

وەک چاوی جوان نەخۆش و سەرخۆش
وەک خاڵی لە سەر ڕووان سیاپۆش

وەک خونچەیی زاری یار دڵتەنگ
ناڵین لە ڕەگی دڵان وەکوو چەنگ

وتیان دەبێ بۆچی ئێمە وابین ؟
کەی جەنگ بووە ئێمە ئەنگوابین؟

یان بۆچی وەها کز و زەبوونین
پڕ دەرد و برین دەر و دەروونین ؟

بەو گێژییە لە گێژی بیر و خەمدا
تاژدین دی لە دەستی کاکە مەم دا

ئەنگوستیلەیەک نقێم لە گەوهەر
دەرناکا لە نرخی کەس سەرەودەر

وەک دەنکی هەنار و ئاگری سوور
شەو بایە، دەڕۆیی تیشکی بۆ دوور

نووسراوە لەسەر وی ناوی «زین»ێ
کێشای دەسی باشتری ببینێ

مەم دی لە دەسی ئەویش نگینێ
هێژای هەموو گەنجی سەرزەمینێ

بێ هەستێ کە سەیری کردە دەستی
ڕەنگیوە بە ناوی خاتوون ئەستی

دوڕناسی جیهان لە ڕاست ئەوانە
هێڕ و وڕ و گێل و هیچ نەزانە

سەدهێندە بە سەنگی گەنجی قاروون
هەر زێڕی هەیە و هەچی لەناو چوون

ناهێنێ لەوانە هێشتە هەشت یەک
هیچیان بۆ نەما جیا لە پەک پەک *
*پەک پەک = پەکوو !

پەک پەک کە چ باشن ئەو نقێمە
ناسیان بەمە یاری دڵ ڕەقی مە

هەرچیان بەمە کرد«ستی» و«زین» بوون
وەدیارە کە فێری دڵ دزین بوون

گۆڕیان لەمە خۆ، بە بەرگی گۆڕاو
لاولاو بە دوو لاو دەهاتنە بەرچاو

ئەو بوون کە لە ڕۆژی جێژنە هاتن
وتمان ئەوە مانگ و ڕۆژ هەڵاتن

ئەو دوو پەرییانە دەستوەشێن بوون
ئەو خوێن شیرینانە خوێن ڕژێن بوون

ئەو بوون کە لە ئێمە بوونە دڵ بڕ
ئەو مامزە بوون کە بوونە شێر دڕ

ئەو هۆشی سەری مەیان ڕفاندن
هەرزان بوو لە نرخی چاو چڕاندن

تاژدین کەمێ هۆش و بیری لا بوو
مەم نابێ بپرسی، هەر نەما بوو

تێی ڕاخوڕی: مەم! دەهەستە بەس بێ!
تا کەنگێ تخێڵ دەبی لە نێو جێ ؟

شێرین ئەمە* ئەو دوو ئاسکی ماڵین
شوورەییە لە دەست ئەوان بناڵین
*ئەمە = ئێمە.

(مەم) هاتە وەڵآم بە ناڵە ناڵی
تاژدین وەدیارە هێشتا کاڵی

زۆرتر لە تۆ خۆم شلۆق دەبینم
زۆر کاریگەرن هەموو برینم

مەمبینە کە وا لەسەر زەمینم
کوژراوی ئەوینی چاوی «زین»م

سینەم هەموو هەنجنە بە برژانگ
گیانم بووە گیر لە ماهی لاجانگ

بێ شوێنە دڵم لە پرچی ڕەش دا
وەک نەشتەرە هەرچی موون لە لەش دا

بەو شیری برۆی کە تازە ساون
بەند بەندی دڵ و جگەر پساون

ئارا لە چ جێیەکم نەماوە
تۆ ئەو «مەم»ی دیوتە، نەماوە

دڵداری بە ڕاستی دای بە سەرما
لەو هێرشە دا، نە دڵ ، نە سەر ما

گیان و جگەر و دڵ و هەناوم
دەست و سەر و پێ و پشت و چاوم

سوێندم بە خودا نییانە ئارام
شێتن هەموو لا، لە لام نەما رام

تا من بە دەمم دەمێ دەکەم شین
ئەو هەر یەکە بۆ خۆ بانگ دەکا زین!

وا دڵڕەقی بەو ژیانە تاڵە
تووش بووم، و دەڵێی بەسە و مەناڵە

وان* بێڵە بە ئاخ و داخ و ناڵان
با بێینەوە سەیری چاو کەژاڵان
*وان = ئەوان.

****

## زین و ئەستی لە چ حاڵ دان ؟

هەر چوونەوە ماڵێ بەو جلانە
ڕووت بوونەوە ئەو کەمەر شلانە

هەرچەندە جل و شمەک کە گۆڕان
چۆن دێنەوە ڕەنگ و دڵ کە دۆڕان؟

دڵداری لە ناو دڵان خزیبوو
گوڵ ڕەنگی لە کولّم و لێو دزی بوو

کەس نەی دەگوت ئەو «ستی» و «زین»ن
پێت وابوو کە خەڵکی ژێر زەمینن

پیرێژنی دێوی ئەم جیهانە
تایەن بوو لە کۆشکی ئەم کچانە

فەرهاد کوژەکەی لەلا تکێک ئاو
گەڕبازی بە ناو «حەیزەبون» ناو

ئەو هات بە سەرا لەوان دەمان دا
چاوێکی خشاند بە ڕووی کچان دا

دیتی، چ ببینێ؟ دووی کز و لات
ئەی خوایە ئەمانە چییان بەسەر هات

وا ماتی خەیاڵ و دوورە ئاگان
بەرچێڵە ونی دەکا چەناگان

ڕووی ڕۆژ چییە، بوونە مانگی یەکشەو
چاوبازکرن ئەمڕۆ بوونە مێ کەو

خوێن بوونەتە بەفری تازە باریو
یاقووتی دوو لێو سپین وەکوو زیو

کوا کاتە کە زەرد بێن گوڵی سوور؟!
دەک ڕۆڵە لە چاوی پیس و بەد دوور!

ئەی هێزی دڵ و کزەی هەناوم
هەریەک لەوە* ڕۆشنایی چاوم
*هەریەک لەوە = هەر کام لە ئێوە .

پارێزەری ئێوە هەر خودا بێ
باڵاو* هەموو کاتێ بێ بەڵا بێ
*باڵاو = بەژن و باڵاتان ، بەژن و باڵای ئێوە .

وا ئێوە ئەوەند لەبەند و بەر چاو
چۆن چوونە دەرێ بە جووتە بۆ ڕاو ؟!

چۆن وا زوو گەڕانەوە بەرەو ماڵ ؟
چۆن سەیرو *نەکرد لە جێژنی سەر ساڵ ؟
*سەیرو نەکرد = سەیرتان نەکرد .

بێژن شتەکە چییە و چ ڕەنگە ؟
سەرگێژییە یان خەیاڵی بەنگە!

گیران بە چ داوێ؟ چۆن تەلێکە ؟
هۆی ئاگرە هەرچی دووکەڵێکە

دەنگێ بکەن و نەکەن کچانم
من بۆ خۆ هەموو شتێک دەزانم

قوومێکی* دەپێژم و دەڕێژم
چوو دیوە لە ڕێوە پێو* دەبێژم
*قووم = لم، ڕەمڵ . * پێو = پێتان، بە ئێوەی .

شیشۆقە و مورووو تێکەڵاو کەم
چیتان لە دڵایە لێو* بڵاو کەم
*لێو = لێتان، لە ئێوەی .

گوتییان بە دزی بە پیرە زاڵێ:
لەو کاتەوە چووینە دەر لە ماڵێ

هەرکەس کە دوچاری ئێمە بوو زوو
شێت بوو، دڵ و هوشییان لە دەس چوو

ئەم زۆرییە زۆرە هاتە ڕێمان
پێوەندی ئەوینێ هاتە پێمان

شێت بوون بە مە و دای لە سەریان
ئێمەش ئەوە بووینە شێتی پەریان

هەر بیستی لەمان، ئەمانە دایە
لووسایی زمانی کەوتە کایە

چاومەس، دەسەروو* گەڕێم هەزار جار
ئێوەی کچی پاتشان و خونکار
*دەسەروو : = دە سەر سەرتان، لە دەوری سەرتان.

کێ بێ کە ببێ لە ئێوە بێ باک
کێ بێ کە نەدات بە ئێوە پیتاک

دەستان* کە بە دەستی هەر کەسێ دا
دەیدا سەر و گیان و دڵ لە ڕێدا
*دەستان = دەستتان.

نەخوازە کە ئێرەیی* بێ دڵدار
من بیگەمێ ئێستە دێتە بەر بار
*ئێرەیی = خەڵکی ئێرە، هاووڵاتی .

کام داری بڵینده دای دەهێنم
هەر شێتی دەکەم دڵی دەسێنم

وتییان هەموو وایە هەرچی دەیڵێی
ناسراوی لە لانی ئێمە، تۆ کێی

دەرمانی برینی (سە)ت* لە دەست دێت
شەرمێکە دەمان گرێ بڵێین پێت
*سەت = سەگت. دەرمانی برینی سەگیشت بەلاوەیە.

دەردی مە گەلێک بە ئێش و ئۆیە
ڕێ کوێرە بە دڕکە، پڕ کڵۆیە

چەندەی هەیە کیژ و کوڕ لە (بۆتان)
چەند هێندە کە ناو براوە بۆتان

هەر کەس بە جوانی ناوی داخەن
نووسراو لە سیایی* ئێمەدا هەن
*سیایی = لیستە.

لەم شارە هەچێکی مەستە چاوە
دیومانن و گشتی ناسراون

ئیمڕۆکە دوو کچ بە ئاڵ و واڵا
وەک یەک بە شمەک بەساڵ و باڵا

دوو ڕۆژ کە هەڵێن* بزانە هەو بوون
هەنیان وەکوو مانگی چاردە شەو بوون
*هەڵێن = دەرکەوتنی ڕۆژ لە ئاسۆ.

تووشیان بوو بە تووشمان لە ناکاو
چۆن دڵ نەپەڕێت و ئاو نەکا چاو

هەر چووینە نزیکی وان بە دیمەن
دیمان نە لە ئاو و گڵ، وەکی مەن

وەدیارە فریشتە یان پەری بوون
دوو سێوی بەهەشتی داوەریبوون

ئەو بۆ مە* بە جووتە کەوتنە داوان
ئێمەش ئەوە شێت دەبین لە تاوان
*بۆ مە = بۆ ئێمە.

ڕوومان وەکوو مانگ و ڕۆژێ وا بوون
ئەو ئاوێنەیەکی ڕوو نوما بوون

ئەو شووشە ئەمیش چرای بەرانبەر
تیشکی مە گەڕاوە بۆ مە لەو سەر

شۆقێ کە گەڕاوە دای لە ئێمە
تاواندی دڵی مە، های لە ئێمە *
*های لە ئێمە! = هاوار لە ئێمە .

سەرکوڵمی مە ئاگری بەگڕ بوون
ئەو وەک دوو چرای لە ڕۆنی پڕ بوون

گڕ گرتیی و کەوتە هەر دوولامان
دڵ بۆتە مەکۆی برین و زامان

سووتاین گش و ئێستە کۆی زوخاڵین
لات وایە کە نوقمی ناو خەیاڵین؟!

****

## سەرگەردانیی تایەن

دایەن سەری سوور بوو لەم وتانە
ڕووی کردە کچان وتی : چتانە ؟

چۆن ئێوە نەچوون بە تیلی چاوان
کوڕ ڕاوکەن و دڵ بەرن لە لاوان؟!

بۆ خۆو کچ و، کچ دەبن بە یاروو؟ *
لام وایە شڵۆقە کار و بارتان
*بە یاروو = بە یارتان ، بە ئۆگرتان.

دڵداری کچان لە ئێوە نایە
کەس ناچتە سەمایە بەو هەوایە

پێویستە کچان بە کوڕ بنازن
لاویش گەرەکە کچان بخوازن

بێهوودەیە کچ لە کچ کە جووتە
لاو، لاوی بویّ لە هۆزی «لووت»ە*
*هۆزی لووت = تایفەی لووت، بەنێوبانگن بەمە کە نێرەکان«نێر باز»بوون و مێیەکان مێباز.

کچ سوورگوڵی دەسچنی خودایە
کوڕ ئاوی ژیانە و، ژینی لایە

کوڕ خوێن و، کچیش لەشن هەتا جوێن*
بێ خوێن لەشن و لەشانی بێ خوێن
*هەتا جوێن = هەتا لە یەک جیان.

تا بێ کچە کوڕ، شەوە بەبێ مانگ
تا بێ کوڕە کچ، نوێژی بێ بانگ

کچ بۆ کچی چۆن بە هاوسەری بێ؟
جا با کچی پاتشای پەری بێ!

گەر گوڵ لە گوڵان ببن بە دڵدار
با خۆڵی وەسەر بێ بولبولی ژار

خوسرەو کە نەبا سواری شەودێز
شیرن لە شەکر دەبوو بە پەروێز؟

فەرهاد و شیرین ئەگەر نەبوونا
ڕووشێک نە دەهات بە بێستوونا*
*کێوی بێستوون ڕووشانێکی بە خۆوە نەدەدیت.

ئەو گش کوڕ و کاڵە هەن لە شارا
بەگزادە و سادە ساز و دارا

چوونوو* دڵو دا بە دوو کچۆڵان
چڵکاو چڵەپێنی* دەرک و کۆڵان
*چوونوو= ئێوە چوون و دڵتان دا بە... * چڵکاوچڵەپێن = چڵکاوخۆر، کەسانی ژێڕای بەرماوخۆر.

بێ ناو و نیشان و کەس نەناسان
کارێکە نە هێندە سووک و هاسان

من دێمەوە هیچ مەبن هەراسان
خەو دیتەن و هێشتە هەر لە تاسان

ئەو چەڵتەچەڵە کە گەییە گوێی «زین»
تێی ڕاخوڕی: بەسیە پیری سەرشین!

نازانی دەڵێی چی کۆنە فەرتووت
هۆشت نییە چی دەڵێی و چت گوت

نەت گوت کە قوم و گڵی بەبا کەی
پێت دەکرێ نهێنی ئاشکرا کەی ؟

ئێستا کە دەڵێی خەیاڵ و خەونە
بیرت وەکوو خۆت ڕزیو و کەونە

ئەو جووتە، فریشتە یان پەری بوون
کچ یان کوڕ و کێ و کوێندەری بوون

دیومانن و ، دەشتەوێ نیشانە
ئەنگوستیلەیان لە پەنجەمانە

گەر جادووگەریت نە هەر زمانە
بییان بینەوە خێوی کلکەوانە*
*خێوی کلکەوانە = خاوەنی هەنگوستیلە.

پیرێژنی زمان درێژ و جادوو
دەرخەن لە دەس! و گوتی :دەجا زوو

تا ڕۆژ ئەوە دەست بە دەسنوێژم
خەو ناچەژم و قومێ دەپێژم

خێو*، یان چ پەری و چە دێو و خێوە
دەیناسم و پێو دەڵێم لە ڕێوە
*خێو = جندووکە.

گورجێ (ستی) دایە هەنگولیسک *
(زین) دادی دەدا دەگەڵ هەنیسک
*هەنگولیسک = هەنگوستیلە.

پاڕاوە لە تایەنێ بە گریان
لێم دوور بێ جگەر دەبێتە بریان

گۆمێکە لە خوێن دڵی هەژارم
هەرچەندە بڵێی ئەوەند پەژارم

ئەو کاتە کە گێژی دڵ دەجۆشێ
گیانم بەرو چوونە دەر دەکۆشێ

فێنکی کوڵی دڵمە ئەو نقێمە
لێم ون بێ جگەر دەبێتە قیمە

سوێندت بە خودا دەدەم گەلێ زووم
بۆ بێنەوە، تاکو بۆی نەمردووم

****

پیرێژنی سەلکە تەپلە گوێنی
بوولێڵە کە دەرکەوت نهێنی

خۆی کرد بە کوڵیتی *جادووێکدا
تۆرتۆی* دەمی سەلم و تووری* لێک دا

*کولێت = کۆخ ، کۆختە ، ژوورۆچکە .
*تۆرتۆ = مەقەست ، قەیچی .
*سەلم و توور= ناوی دوو پاتشای ئەفسانەیی و کۆنی ئێرانییە .

من بێوەژنێکی بێ پەسێوم
بێ خانە و لانە و بێ بژێوم

پەرژینێ بە گوڵ بێ دوو کوڕم هەن
دووی بێکەسی زۆر شڕ و وڕم هەن

ئەو ڕۆژە کە ببوە جێژنی سەر ساڵ
خۆت ڕەنگە بزانی چۆنە منداڵ

چووبوونە گەڕانی چۆڵ و دەشتی
تووش بوون بە ڕمۆزنان* لە گەشتێ
*ڕمۆزن : دێوەزمە، جندۆکە، مێردەزمەی خەیاڵی .

هاتوونەوە شێت و ڕەنگ بزڕکاو
نە شتێکی دەخۆن نە لێک دەنێن چاو

بێ هۆش و زمان، لە جێوە کەوتن
ئەم ماوە حەسانەوە و سرەوتن

دوو مێنەکەیان لە دەستی ناون
دەسیان لێ وەشاوە ئەنگواون

بڕوانە چییە ؟ بڵێ بزانم
دەردت لە کزەی دڵ و گیانم

فێ دارییە، شێتییە، دڵ ئێشە
چارەم بە چییە و چ ڕێم لە پێشە

هەرچی هەیە لەم دووانە ڕایە
ئاڵە و شەوە دەستییان تیایە

خێویان چ مرۆ، چ خێو و دێون
پێمی بڵێ کێن، چن و چ نێون ؟

جادووگەری ژیر و سووک لە شانان
زانا بە گەلێ وشە و زمانان

ئامراز و پسوولە کۆنە ڕانان
دەیڕوانی لە سووڕی عاسمانان

«جووتەی کەو»ی گەش نزیکی یەک دین
دەرچوون ئەوە بوون ستی و تاژدین

سووڕاندی گەیشتە «لەیل و مەجنوون»
بەریان تەمی خەم بوو و زین و مەم بوون

جادوو گوتی بەسییە پیرەدایە
هێند زۆرە درۆت دوایی نایە

لێم بووی بە گوریسی ناو هەمانە
ڕاستی بکە پیشە بەس لەمانە

کوانێ کوڕی چی؟ هەڵی دەبەستی
هاتووی لە دوو کاری زین و ئەستی

لەو دەشتە لە ڕۆژی جێژنی نەورۆز
تووشیان بوو بە تووشی دوو کوڕی قۆز

دوو مانگ و دوو ڕۆژ بە یەک گەیشتن
یەکدەم دەم و دڵ دە یەک گەیشتن

ئەم جێژنە کە دێ لە کوردەواری
زۆر پیشە و باوە کۆسەکاری *
*کۆسەکاری = یاریی خۆگۆڕین .

بۆ بەرگی کوڕان لە ئەستێ و زین
لە کوڕان بوو جلی کچانە پەرژین

ئەو بوون لە گڕەی ئەوینی بێهۆش
ئەم بوون لە مەیی جوانی سەرخۆش

ئەو سووتەڵی گڕمەلای *ئەوینن
ئەم تینوویی کەربەلای ئەوینن
*گڕمەلا = گڕەمەلا ، ئاگری زۆر بە گڕ.

گۆڕیانەوە کلکەوانە دوو جووت
شیشۆقەیی شین بە نرخی یاقووت

تایەن گوتی تۆم گەشەی دڵانی
پسپۆڕی هەموو شتێک دەزانی

ئەو جووتە کوڕەی ئەوەندە قۆزن
کێهە ڕەگەزن لە کامە هۆزن

بەگزادە و خانەدانی شارن
یان بۆرە پیاگ و باب هەژارن ؟

فەرمووی لە ڕەوشتی دڵتەڕی دا
سەودایە هەیە دەڵێن لە وێ دا

دوو دڵ کە بە یەکتری گەیشتن
پێغەمبەر و خواکەیان لە پشتن

نەخوازە ئەوانە دوون شرین کوڕ
مروارییە یەک ، یەکی وەکوو دوڕ

یەک ڕۆڵەیی نووسەرێکی میرە
یەک خزمی نزیک و باب وەزیرە

ئەو تایەنی پڕ بڕ و بەهانە
پێی گوت کە نیشانە نین ئەمانە

دڵداری «ستی»ی و «زین» هەزارە
هەی هوو! چ هەزارە، بێ ژمارە

« کاروانکوژ»ی چاوی ئەو دووانە
پیریش دەکوژێ چە جای جوانە

لێت ڕوونە کە چەندە لەم «چزیر»ە
بەگزادە و خان و مەزن و میرە

چاکەی بکە پەردەپۆشی لادە
کێن ئەم دووە سادە گەورە زادە

بڕیار بێ بزانم و بیان دوێنم
چڵ زێڕێ بسێنم ، بۆتی بێنم

جادوو گوتی خۆت وەبینە شوێنێ
بی پشکنە گش کەل و کولێنێ

هەرکەس کە دەڵێن کزە و نەخۆشە
بۆ دیتنی گورجێ تێ بکۆشە

گەر خۆت بکەیە بزیشک و زانیاز
چاوت دەکەوێ بە هەر دوو دڵدار

ئەم جووتە فریشتە بۆ جوانی
ببیان بینی دەمە و لە حاست دەزانی

نەخوازە لە دەست نقێمی ڕەنگین
ڕەنگینە بە ناوی (ئەستی) و (زین)

لەو کاتەوە پیرە بوو بە لوقمان
تووربێن پڕی شووشە ئاو و هەتوان*
*هەتوان = دەرمان.

دەرمان هەمە ڕەنگە، تۆز و نەشتەر
کۆلانی دەپشکنین سەرانسەر

هێدی و مڕ و مووچ و کووڕ و چاو زیت
پێی وابوو بزیشکە هەرچی دەی دیت

گورجێکی گەیشتە پیشەکاران
زووی دیتەوە جێ تەماڵی* یاران
*تەماڵ = حەشارگەی کەروێشک، شوێنێک کە کەوێشک ێی وەردەکەوێ .

پرسیان چ کەسی، ئەرێ پیرێژن ؟
فەرمووی ژنی چی؟ بزیشکێ بێژن

چاری هەموو دەردێ باش دەزانم
پسپۆڕی دوو ژانی زۆر گرانم

چی ئێشی دڵان و ژانی گیانە
دەستی منە چارەسازی وانە

گوتیان چییە ژانی گیان ، چ جۆرە
ژانێکە وتی نیشانی زۆرە

دەردێکی گەلێ گران و سەختە
چابوونی گرێدراوی بەختە

ئەو ئێشە لە ئێوە دوور، گەلی کوڕ
تیشکێکە لە ڕووی کچا جگەر بڕ

کاتێ دەر ئەچێ وەکوو برووسکە
بێ گڵپ و گڕ و بەبێ ترووسکە

بێ زام و شکست و بێ برینە
ئەو ژانە ئەوینە، زۆر بە تینە

دەیکا بە خەڵووز دڵ و هەناوان
خوێن فیچقە دەکا لە دڵ، لە چاوان

وتیان وەرە سەر دووچاوی ئێمە
بەو ژانە دەژین دوو لاوی ئێمە

دەی بیخەرە ڕوو هەچێکی پێتە
چاوی مە لە پیتی دەست و پێتە

هەرچیت بوێ گورجێ دێتە بەر دەس
هێند زێڕ بەرەوە هەتا دەڵێی بەس

تایەن کە گەیشتە سەر نەخۆشان
زانی بە نیاز گەیی نەپۆشان

فەرمووی بەتەنێو* دەبێ ببینم
وا باشترە شارەزای ئەوینم
*بە تەنێو = بە تەنیایی. واتە کەسی تر بەلاتانەوە نەبێ .

جارێ دەبێ تێو بگەم ، لە پاشی
دەرمانو* بکەم بکەونە باشی
*دەرمانو = دەرمانتان، چارەتان .

هاوڕێ هەموو چوونە دەر لە لایان
تایەن تەکی دا بە تەک برایان

****

## ڕازی دڵداری ئاشکرا دەبێ

دوو لاوە، کە چاوییان هەڵێنا
چاوی مەلەوان لە گۆمە خوێنا

دیتیان یەکی پیرە هەڵتروشکاو
وەک لانکی شڕۆڵ، شەق و شڕ و شکاو

وا ورتە ورت شتێک دەبێژێ
فرمێسکی لە چاوی کز دەڕێژێ

گوتیان چ کەسێکی پیرە دایە
بۆ دەگری؟ وەدەرخە ، چیت لە لایە!

فەرمووی بە سەری «ستی» و «زین»ێ
بۆ ئێوە دەکەم گرین و شینێ

نەخوازە لە کن «ستی» و «زینـ» ـان
دێم ، پێم هەیە شەڵتە* بۆ برینان
*شەڵتە = کوتراوەوەی چەند جۆرە گیای دەرمانی .

ئەنگووستیلەکانوو* ئەم دووانەن
باوەڕ کە نەکەن، ئەوەم نیشانەن
*ئەنگوستیلەکانوو = ئەنگوستیلەکانتان ، ئەنگوستیلەکانی ئێوە.

کوا بمدەنێ هی ئەوان بە مەردی
ئابڕووی دوو کچان مەدەن لە بەردی

ڕاسپاردەم و، تایەنی ئەوانم
نامنێرنەوە ناهومێد، دەزانم

کاتێکی کە پیرەیان وەها دی
هەستانەوە گەشکە بوون لە شادی

یەک ماچی دەدان لە دەستی چرچی
یەک بۆنی دەکرد لە تیسکی پرچی

یەک دەستی لە بەژنی کوڕ وەرێناو
یەک کەوشی دەخستە سەر سەر و چاو

تایەن بەمە جەرگی بوو بە بریان
دەیگووت، بە دوو چاوی پڕ لە گریان:

ڕۆڵەم بە خودای لە ژووری سەرمان
بۆ دەردی دڵوو* دەبم بە دەرمان
*دڵوو = دڵتان ، دڵی ئێوە .

باڵداری هومێد بە داوێ دەگرم
دڵخۆشوو* دەکەم بژیم و نەمرم
*دڵخۆشوو = دڵخۆشتان .

هەر چوارو* وەکۆ دەکەم وەکوو کۆ
کار پێک دێ بە ئارەزووی دڵینگۆ *
*هەر چواروو = هەر چوارتان . * دڵینگۆ = دڵی ئێوە.

ئەنگوستیلە بۆ بەژن نەمامان
هەر بەرمەوە دێنمەوە ولامان

تاژدین لە دەسی دەرانی هی خۆی
پێی وت وەرە فەرموو بیبەوە بۆی

مەم ڕوانی بەبێ نقێمی «زین»ێ
ناژی بە ژیان لە سەر زەمینێ

بمبەخشە گوتی، سەرم لە بەر پێت
هەر دامەوە پێت لەجێ دەبم شێت

ئەو ناوە کە چۆتە ئەو نەقیمە
پێوەندی لە بەندی جەرگ و سیمە *
*سیمە = سیپەلکمە ، سیپەلاکمە .

گەر بت دەمێ بەندی دڵ پساوە
بێ ئەو لە ژیان بەشم بڕاوە

ئەی دایە لە ڕێی جوانی «زین»ێ
با بێت بەزەییت بە دڵ برینێ

گەر چوویەوە زین دەبینی هەر دەم
پرسی کە لە من بڵێ دەڵێ مەم:

ئەو شایە ئەگەرچی من گەدا بم
لێم ڕوونە کە ناهومێدی نابم

با خواستن و دیتنی نەوێرم
دڵخۆش بە خەیاڵی ڕادەبوێرم

ئاخ خۆزگە لە پێش ئەوەی دەمردم
دەمگوت ئەوە «زین»ە یادی کردم!

زۆر جوانە لە ئاهی دڵ بترسێ
جارجارە چلۆنەیەک* بپرسێ
*چلۆنەیەک= چۆنی ! چاک و چۆنی، لێپرسین .

****

## گەڕانەوەی تایەن

ئەو هەر دوو بەژن نەمامی وا شەنگ
دانیشتوو لە چەشنی خونچە دڵتەنگ

خاوی مەیی خەوپەڕێنی دوێنن
بە هومێدی مەیێکی خەم ڕەوێنن

چاویان دەگەڕاند، دییان لە ناکاو
وا تایەنە دێ بە وردە هەنگاو

سەیری بوو کە پیرە هاتە ژووری
پوورەی* بوو پەری لە دەوری پووری
*پوورە = شەڵخەی مێش هەنگوین .

پیرۆزە گەیشتە دیدە مەستان
ماچ گەییە هەزار لە لاق و دەستان

وتیان بڵێ ئەو فریشتە کامن
دوورن لە وزەی تۆ یانە ڕامن

ئەو دوو پەرییەت لە تەپکە هاڵا؟
یان هاتییەوە بە دەستی واڵا!

ئەو تیری لە جەرگی ئێمە ڕاچوون
هاوێژەری وان دەزانی کێ بوون ؟

سوێندم بە دوو چاوی مەستی ئێوە
وا دێم، وتی لای ئەوان لە ڕێوە

چەندم بەزەیی بەوانە دا دێ
چوو کردووە بەژنوو* بێ بەڵا بێ؟ !
*بەژنوو : بەژنتان، بەژنی ئێوە .

هەر جارێ ستی و زین دەبێژن
چاویان دوو پلووسکە خوێن دەڕێژن

تایەن دەبەروو* مرێ کچانم
چەند ساڵە ئەوێستە پێو *دەزانم
*دەبەروو = دەبەرتان، دەبەر ئێوە . * پێو = پێتان.

ئەو جووتە کوڕەو* چلۆن بژاردن
چۆنتان بە خودای ئەوین سپاردن
*کوڕەو = کوڕەتان.

بەو خودایە کە کەس نییە لە ڕەنگی
ئەو جووتە لەباری شۆخ و شەنگی

سەرتۆپی کوڕانی ئەم جیهانەن
تای ئێوە ئەگەر بکەن، ئەوانەن

دوو سێوی بەهەشتی لەت کراون
دوو لەت ئەوەتا دوو ئەو دوو لاون

وای گرتنە بەر بە چاو و ڕاوان
هەر هێندە بوو شێت نەبوون لە تاوان

ئاوری دەگەیاندە نەوت و پووشوو
هەر خۆشی دەکرد و گڕ بڵیند بوو

دڵ توورە* ، ئەوین گڕێکە داگر
دڵ چەندە تەڕە هێندە دەگرێ ئاگر
*توور= مەبەست کێوی تووری سینا- یە.

وەک تاقە* لەش و ئەوین چرایە
گیان ڕۆنە پڵیت نە ئاشکرایە
* تاقە = جاران لە دیواری ژووری ماکەکاندا جێگایەک بۆ دانانی چرا ساز دەکرا. ڕووناکیی تاقە، بە بوونی چرا بوو. ئەگەر چرا نەبوایە، تاقە و ڕفە بێ روناکی بوون.

گەر ڕۆن و پڵیتە گەر چرایە
بەسراوە هەمووی بە تاقە* تایە
*تاقە = تاک ، یەکدانە، هەودایەک.

بەم ئاگرە گشتییان سەر و بەر
سووتان و یەکێ دەری نەکرد سەر

گوتییان دەبێ ببیە چارە سازمان
کارێکی بکەی نەشێوێ نازمان

ئاودێریی و، ئێمە هێشتە کاڵین
تۆمان نەبێ، ئێمە لاڵ و پاڵین

تۆمان نەبێ وشک دەبین و بێ بەر
هۆشمان نەدەیەی دەکەین خەزەڵوەر

تۆی بۆمە بەڕاسی سەرپەرشتی
هەر تۆ کەس و کار و گشت لە گشتی

نەت وت؟ وەکوو دوو پەپوولە ئەو لاو
بۆ (مەم) شڕووکاو و هەڵپڕووزاو؟!

دەیسا دەبێ چەندە چاوەڕوان بن
زوو نەچییەوە زۆر نزیکە شێت بن

هەر ڕاکە بە لەز بڵێ بە تاژدین
ئەو ئەستی دەوێت و مەم ، زین!

مزگێنی لەوان بێ، ئێمە سازین
ئاواتی مەشە* و بە دڵ دەخوازین
*مەشە = ئێمەشە ، هی ئێمەشە .

بۆ وان دڵی ئێمە گەرم و نەرمە
درکانی گرانە، کچ بە شەرمە

ئەو پەردە لە ڕووی کوڕان نەماوە
شەرمێونی دمبەگی دڕاوە*
*دمبەگ دڕاو = مەبەست لە ئاشکرابوونی نهێنی یە .

خوازبێنیکەران بنێرنە پێشێ
هیوا هەیە کەس پڕی نەکێشێ

تۆ خوا بڵێ بەو دوو لاوی دڵبەند
چەندیان هەیە دۆست و دەست و پێوەند

هەرچی کە دەڵێن نزای ڕەوایە
گشتی لە خودا بکەن تکایە

ئەم دووریيەمان لە ناو وەلا بات
پێکمان ببڕێ و بگەینە ئاوات

****

## خوازبێنی

چەند خۆشە نەخۆش، نەخۆشی دڵ بێ
کەم مابێ نزیکی گۆڕ و گڵ بێ

لەو کاتە بزیشکی بۆ پەیا بێ
دەرمانی دڵی بکات و چابێ

چەند خۆشە وەڵام بگاتە دڵدار
مزگێنی بداتێ ساز بووە یار

دیسان وەرە سەیری پیرە تایەن
فێلاوییە کە فێڵی لەبنە نایەن

بۆی کەوتەوە ناو جلی بزیشکان
چاویلکە لە چاو و دەس بە پیشکان *
*پیشک = داردەست، ئامرازی گیا هەلکەندن .

خۆی کردەوە لانی جووتە لاوان
خۆشی و بزە وا لە لێو و چاوان

مزگێنی لە چەشنی ئاگری گەش
ڕووناکی دەکرد لەوان شەوی ڕەش

فێنکایی دەدا دڵی بە کوڵیان
سارێژ بوو هەموو برینی دڵیان

مزگێنی درا بە خزم و ئاواڵ
شادمانیە، باری کرد دەمی تاڵ

کۆبوونەوە هەر یەکەی لە لایە
چەند پیر و ڕدێن سپی و مەلایە

هەرچی کە لەپێش* و کەیخودا بوو
گشتی بەر و ڕووی لە ماڵی شا بوو
*لە پێش = ماقووڵ ، ڕیش سپی.

گوتیان دەسەرت گەڕێ سەر و ماڵ
پێشکەشتە ژیان و زیچ و منداڵ

مەزنی گەلی کوردی، مەرد و ڕەندی
خاوەن دەسەڵات و گیر و بەندی

سەرمان هەموو پردەبازی سەر ڕێت
چی سارد و گەرم نەیێتە بەر پێت

تۆی سایە چەور* لەسەر سەی مە
تۆی هاندەری بۆ پەنابەری مە
*سایەچەور = نان بدە، ڕۆژی دەر ، سەردار و سەروەر.

ڕووت نا لە کەسێک گەلێ بە بەختە
کێ تۆ نەتەوێ ژیانی سەختە

تاژدین کە نزیکە خزمی تۆیە
بەندەی هەرە چووک و نزمی تۆیە

ساوا بوو لە کۆشی دایک و باوا
زاوا بووە ئێستە بیکە زاوا

هیوا ئەوەیە ڕەوای ببینێ
ئەستی بدەیە بە هاوسەرینێ

فەرمووی چ دەڵێن دەبا وەها بێ
جێگیرە شتێکی پێو* ڕوا بێ
*پێو = پێتان ، لە لاتان .

دەمڕاست و مەلا بڵا نەوەستن
تاژدین و ستی لە یەک ببەستن

زۆر شادە دڵم بە کاوی ئاوا
پیرۆز بێ ژیانی بووک و زاوا

هەستا دەم و دەس چەکۆی بە دڵ ژیر
بەسپاسەوە کەوتە دەست و پێی میر

خوازبێنیکەران لە بەگ لە میران
دارا و نەدار و لاو و پیران

پاڕانەوە مەزنی کوردەواری
زیندوو بێ بە کام و پایەداری

فەرمووی بکوتن دەهۆڵی شادی
وەک ئەو هەلە کێیە بێتە یادی

مەیگێڕ نە دەمی تنۆک ـ تنۆکە
مەی کۆنە لە زاری کووپە ڕۆ کە

هەل هاتووە خەم بدەین بە بادا
هەڵکەوتووە کەس لە دەستی نادا

کێ زانی ؟ وچانی با نەخەینێ*
شەو ئاوسە، چی دەبێ سبەینێ
*وچانی با نەخەینێ = با لێی ڕانەوەستین ، با مەودای نەدەینێ.

دڵشادیی و شین بەری زگێکن
گریان و کەنین بەری لکێکن

پێکهاتی گەڕی ئەم ئاسمانە
جارێکی ژیانە دووی نەمانە

ڕووناکە بەرێک، سەرێک تەپ و مژ
کچ بەخشە چەلێک، هەلێکی کوڕ کوژ

دنیا وەکوو شیرە لێی بترسێ
گەر هاتە بڕین لە کێ دەپرسێ ؟

هەل هاتووە خۆشە، چاوەڕێی چین؟
بڕیار بێ سەبارەتی بە تاژدین

مەزنایەتی لەوێ بوەستێ، ئێوە
دامنێن وەکوو خۆ، لە ئێستە پێوە

زۆر هاتووە ئەو بە دەوری مندا
دەست پاک و بەکار بوو هەر لە بندا

شێرێکە لە جەنگ، گوڵە لە ئاهەنگ
دەنگداوەوەێکە* ژیر و بێدەنگ
*دەنگداوەوە = ناودار ، خاوەن ناو.

پێویستە لە ڕێی کوڕێکی ئاوا
ئەمنیش ئەمەگم هەبێ لە چاوا

نۆرەی منە جا لە سەرمە هەستم
بۆ کۆمەکی ئەو کەمەر ببەستم

کێ بێ و کەسی وای هەبێ، گییانی
نابەخشێ لە ڕێی بە کامەرانی

گەر بمبێ نە هەر سەرێک ، هەزار سەر
گەنجینەیی سەر زەوی سەر و بەر

نەیدەم لە ڕێگای کەسێکی وا دا
مەردایەتی من بچێ بە بادا

تاژدین کە لەوێ دەسە و کەمەر بوو
بەروانکەیی کارکەری لەبەر بوو

ئەو خێوی شکۆیە هەر لە جێدا
لێی کردەوە خۆی لە خۆی گرێدا

ڕازاندیەوە جۆرە نان و خوانێک
خوان هەر مەڵێ، ببوە عاسمانێک

پێت وابوو لە سەر سەلان* لە جێی نان
کوللێرەیی مانگ و ڕۆژی هێنان
*سەلە = چەشنە زەرفێکە سازکراو لە توولی لاوێن و سوورەبی، کە بۆ نان لە سەر چنین دەکاریان دێنا.

ئەو لەنگەرییەی* لە زێو و زێڕان
عاسمانی لەسەر دەسان دەگێڕان
*لەنگەری = دەوری ، دەفری چێشت لەسەر خوادرن.

تا کاوڕ و کیسکی عاسمانان*
برژان و نرانە بەر میوانان
*کاوڕ و کیسکی عاسمان = مەبەست دوو مانگ لە بەرجی فەلەکی دا.

هەر قاپی زەلام لە ڕەنگی بورجێ
سەرپۆشی فرێ درا بوو گورجێ

کۆجیلە* و پیاڵەکانی فەغفوور
ئەستێرە و ڕۆشنی دەدا دوور
*کۆجیلە = کاسەی بچووکی لە دار ساز کراو .

شاکاشی* هەموو لە چەشنی عەمبار
سەرڕێژ وەکوو نەوسی پیاوی بەدکار
*شاکاشی = کاشی ی زۆر گەورە.

خواردن هەمە ڕەنگە، چەور و شیرن
نەرمیش بۆ بەشی ئەوانی پیرن

ئاوخۆرە و قومقمۆکی چینی
ناو ژوور دەگەڕان بە نازەنینی

ئەستێرە گەڕیدە بوون ئەوانە
دەت دین هەموو دەم، نە هەر شەوانە*
*نە هەر شەوانە = نەک هەر شەوانە، بە شەو و بە ڕۆژ.

هەرمێ و هوڵو، شەڵانیی و سێو
دەتوانەوە هەر دەگەینە سەر لێو

نارنج و بەهێ و هەنار و لیمۆ
چەرخیان بوو لە بەر شەقا وەکوو گۆ

ماستاو و گوڵاو، خۆشاو و قەنداو
فێنکایی دڵان و جوان لە بەر چاو

ئەسپەندەر و داری بۆن دەسووتان
بۆنێکی بەهەشت دەهاتە لووتان

دەنگخۆشی بە ناو و دەنگ، سەماکەر
دنبەگ ژەن و تەپڵ و دەففەلێدەر

دەت ڕوانی هەمووی بە شێوە هاو ڕەنگ
لەو بەزمە هەمووی ببوونە هاودەنگ

شمشاڵ و کەوان و تار و تەنبوور
زۆڕنا و کەڕەنا و ساز و سەمتوور

حەیران و مەقام و خاڵی ڕێبوار
پاییزە و نیوەشەو، ئەرێ یار

وێکڕا دەر ئەچوو بە ڕێک و پێکی
بێ قۆرت و گرێ، بە لووس و لێکی

بلوێر کە دەسی دەکرد بە ناڵان
دەیبرد دڵ و هۆش و بیر بە تاڵان

مەیگێڕ بە بەرامە گێژ و وڕ بوو
مەیخۆر وەکوو کووپە ورگی پڕ بوو

بانگی بوو لە کووپە خوڕخوڕی مەی
سەرخۆشبە! خەم و کەسەر هەتا کەی ؟

شت هێندە هەبوو، کێ لە چی دەپرسی
کێ بیری دەکردەوە لە برسی

سەرنووسەری عاسمان لەوێدا
ڕامابوو بنووسێ ، خۆی فڕێ دا

دیتی کە هەزار یەکی بنووسێ
نابڕێتەوە تا بنووس دەخووسێ

زوهرە لە سەما کەوت شکاوباڵ
خۆی شاردەوە مانگ لە کونجی قرژاڵ*
*قرژاڵ = مەبەست مانگێکە لە بورجی فەلەکی دا.

کەیوان *چووە دۆڵچە ڕێی نەناسی
کرپار سەری بردە ورگی ماسی*
*کەیوان و ماسی = مەبەست لە مانگی بورجی فەلەکین.

کۆمەڵ هەموو دوور لە دەرد و ئاخان
پیرێژنی عاسمان لە داخان

کۆم ببوەوە، ڕەنگ پەڕیو و جاڕز
هیچ کاری نەمابوو ببوە کا دز

شاری و ڕەمەکی و نەناس و گەڕناس
دارا و نەدار بە کەوش و پێخواس

گشتی دڵی خۆش لە بەزم و ئاهەنگ
پەیدا نە دەبوو بەتیت* و دڵتەنگ
*بەتیت = پەرێشانحاڵ.

کاتێکی لە کۆڕێ چوونە دەر پیر
لاو هاتنەوە جێگە، بانگی کرد میر

تۆی لاوی بژاردە (مەم) لە ناوا
هەر خۆت ببە ئاریکاری زاوا

ڕازاوە لە چەشنی یەک لە بەر گا
یەک بە بزەیە، یەکێ کزەی لە جەرگا

دەرچوونە دەرێ کە ڕای ببوێرن
گوێ* تاوێ لە ڕازی یەک بدێرن
*گوێ = گوێچکە.

****

## گواستنەوەی ستی

ئەو کاتە کە تازەبووکی ڕوو سوور
سەرپۆشی ڕەشی فڕێ دەدا دوور

ڕازاوە وەسەرکەوت لە ئاسۆ
ڕازاندییەوە دەشت و دەر، کەژ و کۆ

بووک جوانکەر و تایەن و پەرستار
سەرگەرم و خەریک لەبار و پڕکار

چۆن سازی بکەن ستی و «زینـ»ـان
چۆن ناز دەدرێ بە نازەنینان ؟

ڕوانیان لە ڕەشایی بسک و خاڵان
دیانن کە دڵان دەبەن بە تاڵان

هەر گەینە نزیک برۆی کەوانی
گێژ بوون لە کری* خودای جوانی
*کر = دەسکرد، کردە .

سەر ڕوومەتی سوور چهاتە بەر چاو؟
سوور بۆوە لە شەرمی وانە سووراو

توانای نەبوو کل بگاتە چاوان
هەر بوو بە خەڵووزی ڕەش لە تاوان

سەرتاپێ گەڕان لە چەشنی شانە
دەستیان کەوێ موویێ بۆ نیشانە

شێوان وەکوو پرچییان و نەشبوو
چم وت؟ تەنێ گەینە تاقە یەک موو

ئەو مووش نە پەڕیوی پرچی سەر بوو
تای ژین و ژیان و مووی کەمەر بوو*
*لێرەدا مەبەست لە باریکبوونی نێوقەد و کەمەری کچەکانە.

پشتێن نە دەبەسترا لە سەر موو
گیان ترسی پساندنی لەبەر بوو*
*لێرەدا مەبەست لە باریکبوونی نێوقەد و کەمەری کچەکانە.

کێ توانی کە تێوە ڕابمێنێ
ترسی بوو لە دینی بیشکێنێ

سەرپەنجە لە ڕەنگی گوڵ دەڕەنجان
ڕەنگ و خەنە چۆن لەوێ دەگونجان

ڕەنگێکی خودا هەڵی بژێرێ
گۆڕاندنی کێ هەیە بوێرێ ؟

وان* و خەنە پاشی ناهومێدی
چاریان بە تەنێ لە ماچی پێ* دی
*وان = ڕازێنەر، ڕازێنەری چاکە . * ماچی پێ = پابۆس، ماچ کردنی قاچ.

ئەو خشڵی کە بوو لە دوو گوڵی شەنگ
تیشکەی لە زەوی دەدا بە حەو ڕەنگ

پیرۆزە کڵاوی گەییە سەر سەر
ڕووناکی درا بە تانجی گەوهەر

سەردێری لە ڕووپەڕی خودا کرد
ئەو ڕەنگی بە خشڵ و زێڕ پەیا کرد

ڕازانەوەیەک لەوان کرا بوو
خەرمانە بوو دەوری مانگی دابوو

لیزگەی دوڕ و لاڵ و بەندی گەوهەر
بسک و خەت و خاڵی ڕندی دڵبەر

نەخش و خەت و تیپ و پیتی قورعان
نیشانە بە خاڵ کرابوو نیشان

ڕەنگێ لە خوداوە یەک لە دەستان
چاو ڕوونکەرەوەی خودا پەرستان

بێ باوەڕێ ئەم دووەی بدیبا
بێچارە دەبوو کە باوەڕی با

ڕازایەوە شار لە چەشنی بووکان
بازاڕ و شەقام و ماڵ و دووکان

پۆشرابوو هەموو بە ئاڵ و واڵا
سەر خوانچە بە لالە*، بان *بە ئاڵا
*لالە = مۆمدان= شەمدان ، چەشنە چرایەکی باریکی باڵابەرز بوو لە کانزای(مسوار) یان لە مس ساز دەکرا. مۆمیکان لەسە دادەگیرساند و لە سەر خوانچەی ماڵی بووک زاوایان دادەنان و بە شایی و هەڵپەڕکی دەیانبردە ماڵی بووک و زاوا.
*بان = سەربان.

چەند سەد کوڕ و کیژی نازپەروەر
خوانچەی دوڕ و گەوهەری لەسەر سەر

باربەر* بووە ڕێز و زێڕ بە باران
هەرچی بە نرخ هەبوو لە شاران
*باربەر = کۆڵ هەڵگر، مەبەست لەو چەند کەسەیە کە جیازی بووک بە کۆڵ هەڵدەگرن و دەیبەنە ماڵی زاوا.

جیازێکی بەدەر لە سەنگ و هەژمار
هەر لۆک* بوو نکەی دەهات لە بن بار
*لۆک = نێرە وشتر.

قورسایی ئەوەندە گەییە عەرزی
بوولەرزە بوو دار و بەرد دەلەرزی

دنیا وەکوو بوو، بۆ تەماشا
دەریای لە مرۆ بۆ حەوشی پاشا*
*حەوشی پاشا = حەساری ماڵی پادشا.

جارێک بە شەپۆل و گا بە پەنگاو
جێی دەرزی نەما هەڵێنی هەنگاو

دەروازەیی خۆشییان کراوە
لەپڕێکەوە هاتە دەر کەژاوە

گێژاوە، کەژاوەکەی ستی هات
کۆشکی پەرییان بە ڕاستی هات

پێشڕەو کوڕ و کیژی دەس بە کەمبەر
سەر تا بە پێ زێو و زێڕ و زەمبەر

تەختێ وەکوو بەختی ئێمە ڕەش بوو
بەس ئەو نەوەکوو مە *دوورەبەش بوو
*وەکوو مە = وەکی ئێمە ، وەک ئێمەمانان.

لاڵ و دوڕی بەندی دەور و بەر بوو
بەڵکیسی* لەسەر بوو بەختەوەر بوو
*بەڵکیس = بەلقەیس: شاژنی سلێمان.

سەد(ئاسەفی بەرخیا)ت* بدیبا
تەختی دەرفاند بە شان وەکی با
*ئاسف = گەورە وەزیری سوڵتان مەحموود.

ئەو تەختی ڕەوانە وەک گەمی بوو
دەریاکەشی گشتی ئادەمی بوو

دەریایی ئەوینێ تێک بهاڵێ
ناچارە دەگاڵێ یان دەناڵێ

وەک پۆلی پەپوولە دەوری شەم دا
سووتانی دەوێ بە دڵ لە دەم دا

پێت وابوو گییانە* ئەو کەژاوە
گش ئەو لەشە هێندە دەوری داوە
*گیان.

دەروێش و مەلا و هەژار و پاشا
کەس هۆشی نەما لەبەر تەماشا

ئەو ڕۆژە کە سەر ببا بە دەرمان
دیاری نەبوو ون ببوو لە شەرمان

هێند ئەسپ و پیادە تێکشا و هات
بێچارە پەژارە کەوتە شامات *
*شامات = دەشتی شۆرەکات.

کێی وابوو بمایە هۆش نەبردوو
هێنایە سەمایە کۆنە مردوو

شمشاڵ و گەواڵ و تەپڵ و شەیپوور
ئاوازی بلور و ساز و سەمتوور

گۆرانیی و بەزم و چەپڵەڕێزان
قاقا و هەرای مناڵ و خێزان

لەرزانە و خشڵی هەوری لاران
ڕمبازیی و هەوهەوی سواران

لەو ڕۆژەوە سەر زەوی، زەوی بوو
تاوێستە شتێکی وای نەدیبوو

دەریا و گەمی و پەری لە ناوا
بەو زەمزەمە گەیینە ماڵی زاوا

تاژدین لە بەرێک و مەم لە لایێ
مانگێ لە تەنیشتی پادشایێ

چەند میر و مەزن بە چوستی هەستا
گش سینی و یاڵتەبەک* لە دەستا
*یاڵتەبەک = یاڵتەبەق = چەشنە سینی و کەشەفێکی گەورە و پانی لە تەختە ساز کراوە، کە جاران لە دوکانان دا میوەی وە سێو، قەیسی، ترێ و...یان، لە سەر دادەنا .

هەر سینییەکی لە زێڕ و یاقووت
هەر یاڵتەبەکێ لە زێو و زەمڕووت

سەرپاکی لە زێڕ و لیرە دارماڵ
داباری لەسەر کز و نەدار ماڵ

ڕێژنەی بە تەوژمی ئەو دراوە
لیزمەی وە تەکانی* خست کەژاوە
*وە تەکان = وەجووڵە ، وەلەرزە .

زۆرتر لە چڵێسی نەوسی بەدکار
جێی هێشتبوو دەستەڵاتی زۆردار

ڕابرد لە دەهەندەیی* دەهەندان
دەرچوو بوو لە فیزی خۆ پەسندان
*دەهەندە = بەخشین ، بەخشینەوەی ماڵ و سامان بە نیازمەندان.

ڕووت و ڕەبەنی دراو، وەکوو کەر
گیرفانی دەئاخنین لە دوو سەر

بێ جووت* دیەویست کە تۆ بچێنێ
دەم ڕووت* دەگەڕا ژنێکی بێنێ
*شامات = دەشتی شۆرەکات * . دەمڕووت = قوشەغ، سەڵتە، بێ ژن و ماڵ.

پڕکار و نەدار و ڕووت و تەڕپۆش
دارا و هەژار و مات و دڵخۆش

دەت دین ئەوێ ڕۆژێ ڕێک و پێکن
پێت وابوو هەمووی برا و بەشێکن

جیایی نە بە دڵ هەبوو نە بە شمەک*
دڵخۆش و بە دڵ هەمووی وەکوو یەک
*شمەک = شت و مەک ، کەلوپەل.

گچکە و زلی مەستی بادەیە و مەی
گوێ پڕ بوو لە هەی هەی و لە ئۆخەی

دار و دەوەنیش دەهاتە سەر جۆش
داروغە* و پیر ببوونە سەرخۆش
*دەمڕووت = قوشەغ، سەڵتە، بێ ژن و ماڵ.

هێند مەستی دەبەنگ* هەناسە تەنگن
هێندێک بە گەشە و کەن و جەفەنگن
*دەبەنگ = گێلۆکە، گەوجۆکە، نەفامۆکە.

هاتبایەتە سەیری لات و لووتان
خۆیان دەنواند بە شات و شووتان

مەقلاتی* دەدا یەک و یەکێ باز
زۆرانی دەگرت یەک و یەکێ گاز
*مەقلات = سەرمەقولات، تەقڵەلێدان و خۆهەڵگێڕانەوەی مرۆڤ .

لەولاشەوە نەونەمامی دڵبەند
شیرین و بە زەردەخەند و دەم قەند

ڕوومەت گوڵ و لەش گوڵ و کراس گوڵ
پاکی گوڵی سەرچڵ و لەبەر دڵ

زێڕ کەمبەر و لارکڵاو و موو ڕەش
مانگ هەنیە و مەستەچاو و ڕووگەش

هێند توێلی* گوشاد و هێندێ دەم تەنگ
خۆشدەنگە گەلێک و گشتی خۆشڕەنگ
*توێڵ = نێوچاوان.

لاجانگ وەکوو زیو بژانگ وەکی تیر
پرچی ڕەشەمار برۆ وەکی شیر

مەمکۆڵە هەنار ، چەناگە سێوان
سەرچاوەیی ئاوی ژین لە لێوان

کێل گەردەن و بەرز و ڕوو بە خاڵان
کەم تێدەپەڕن لە چاردەساڵان

هێندێ گەلێ لووسترن لە گۆی زێو
هێندێ کەمێ گەندەموو لە سەر لێو

بە کوێری جیهانی پیری پشت کووڕ
گشتی بە سەماوە بۆی دەدا سووڕ

کچگەل وەکوو کۆ و حەتەوانان*
کوڕگەل خولی پێدەدان بە شانان
*کۆ و حەوتەوانان = ناوی دوو کۆمەڵە ئەستێرەی ئاسمانە .

کۆزیلکە* لە لایێ ڕەو لە لایێ
ڕێز دوور و درێژ دوایی نایێ
*کۆزیلکە = بازنەیی کۆبوونەوەی مرۆڤ.

حەو ڕۆژ و شەوان کە ڕۆژ ئەگەر شەو
گۆوەند و بەزم بوو تار* ببوو خەو
*تار ببوو خەو = خەو لە چاوان تارا بوو، خەو ڕەوین.

ئاهەنگی وەها لە کوردەواری
نایێتەوە ڕووی جیهان چ جاری

****

## زاوا و بووک لە پەردە دا

زاوایی بە شۆقی ڕۆژ، بەیانی
میوان بوو لە بووکی عاسمانی

بێگانە بەدەر بە ڕۆشنایی
کش بوو کش و ماتی تاریکایی

ئەو ڕۆژی دەکەوتە پاشی حەوتوو
ئەستی گڕی خۆی گەیاندە پوشوو

لێک دووریی و لێک نزیکی ئاوا
وەک ئاگرێ کەوتە بووک و زاوا

زوو پێک نەگەیین هەناسە دێنێ*
کلْپەی لە ئەوینێ هەڵدەسێنێ
*مەبەست، ئەو دوو دلبەر و دڵدارەی کە زوو بە یەکتر نابڕێن، لە دووریی یەکتر هەناسە سارد و خەمبارن.

هیوا و ئەوین کە بوونە هاوڕێ
فریای نەکەون هەناوێ دەبڕێ

سووتاوی بە یەک نەگەینی ساڵان
سووتان لە پەلەی لە یەکدی هاڵان

دەریایی ئەوینێ هاتە جۆشین
ئارامیی و هۆش و خۆشی پۆشین

چەندی لە کچ و ژن و لە بەربووک
چەند لاوی لەبار و قۆز و خوێن سووک

دیتیان بەسە دووری، ئێش و دەردە
هەل هاتووە زاوا بچتە پەردە*
*پەردە = ئەو ژوورەی، کە شەوی زاوایەتی، بۆ بووک و زاوا ڕازێنراوەتەوە.

به گوێرەیی ڕێ و شوێنی جاران
ڕێک، کەوتنە کار و باری یاران

ڕازایەوە پەردوو، چەشنی بووکان
پەردووی چی، بڵێ ببوو بە دووکان

پڕ بۆن و بەرامی خۆش سەرانسەر
مەی کۆن و مەزەی نوێ لە بەرانبەر

دەفر و هەوڕ* و پییاڵە سەر ڕێژ
پڕ شیرن و ترش و چەور و خۆش چێژ
*هەوڕ = لەنگەرە ، دەوریی چێشت تێدا خواردن .

هەرچی دڵ و زار و سەر دەکەن خۆش
هەرچی خەم و کوڵ دەکەن فەرامۆش

ئامادە و ڕیزکراو لە ناوا
چاویانە لە دەستی بووک و زاوا
چەند دۆست و برادەرێک هەڵستان
مۆمدانی لە زێڕی سوور لە دەستان

مۆمێک لە بەری، لە دوور، شەوانە
هۆنباتەوە لیزگە زەنگییانە

دایان نا لە کۆڕ لە بانی سینی
دەیگوت بە زمانی ئاگرینی

زاوا بەسە هێندە شەرمە شەرمە
تۆش ڕەنگ و دڵت پەڕیو و گەرمە

بولبول چتە خۆت لە گوڵ دەکەی سڵ
بفڕە و بگە سوورگوڵی لەسەر چڵ

پەروانە ببینە مۆمەکەی خۆت
فرمێسکی دەڕێژێ وا ئەویش بۆت

تاکەی وەکە من سووتان و ساچان
ڕاکە و بگە دەمدەمان و ماچان

وا ڕووگە و کابە لێت نزیکە
حەج کەوتە سەرت دە هەستە بیکە

حەو جار بگەڕێ لە دەوری یارێ
خاڵ ماچ کە هەزار چەلان نە جارێ

چاو تێر کە لە سەیری شەکرە سێوان
تێر هەڵمژە ئاوی ژین لە لێوان

دەس بگرە بە بسکی لوول دراوی
بخوازە نیاز بە ڕاشکاوی

تاژدین لە نیاز گەیی، بە بێ درەنگ
دی بەسیەتی کات و، دڵ بکا تەنگ

دەرکەوت و (مەم)یش لەگەڵ وی هەستا
دڵ بە دڵەوە چەسپ و دەس لە دەستا

ئەو چوو لە ستی ببێتە هاودەم
بۆ پاسدەری دەرکە ما لەوێ مەم

هەرچەندە کە خۆشەویستی خەڵکە
پیاو، هۆشی لە خۆ بێ زۆر بە کەڵکە

داخوازی پەری لە دیو بسێنە
دڕکیش هەیە هەر لە گوڵ مەپرسە

ئیوا هەیە چقڵ و هەن گڵووکن
هەن پیاوی بە نرخ و هەن چرووکن

****

## پێک گەیشتنی زاوا و بووک

زاوا کە وەژوور کەوت لە پەردوو
بوە جێژنی بەڕاستی لە هەر دوو

بووک بۆ ئەم و، ئەم بەرانبەری بووک
بۆ یەکدی چرا و، پەپوولە هەر دووک

لەولاوە ستی بە باوەشی واز
پێشوازی دەهات بە ناز و نیمناز

مافوورەیە زۆر لە لاقی دڵخواز
پرچی ڕەشی ڕادەخا لە ڕێباز

دوو چاوی کزی شەوانی دووری
گەش بوونە خەو بە جارێ بووری

پێشان وەکوو ڕێ و شوێنی چەند ساڵ
بۆ شیرنیی دەم بە مەی کرا تاڵ

قوم قوم مەیی قومقمۆکی بادە
دەیگوت کە بە بادە خەم بە بادە

هەر یەک بە پیاڵەیێکی سەر ڕێژ
سەرخۆش و بە گەشکە بوون ، نە سەرگێژ

شەرمێونی داکەوت بە بادە
بەربوونە گیانی یەک دوو سادە

باوی گەشەکردنی دڵانە
بۆن کردنی خەرمەنی گوڵانە

مێلاقەیی کوڵم و لێوی تێراو
شەوبۆی سەر و بسک و نەرگسی چاو

سێوی چەنە، مەمکی زەردە لیمۆ
هەر یەک، یەکی بانگ دەکردە لای خۆ

ئیوا هەبوو تێکییان دەبەستن
هێندێکی دەگەستران بە گەستن

ماچ گەییە هەزار، بڵێی نە زۆرە
بۆ ماچ نە ژمارە ما نە نۆرە

دەیخستنە جێوە بێ گوڕ و هێز
دەستە و مل و، هەڵگووشین لە ئامێز

دەتلانەوە یەک بەسەر یەکێدا
بازاڕی گەرم بوو ماچ لە وێدا

کوڵمی گوڵ و لێوی قەندی دڵبەند
تێکەڵ دەبوو دەم بە دەم گوڵ و قەند

وێک کەوتن و لێو لە لێو خشاندن
دوو ئاگری دوو لەشی گەشاندن

چەسپان بە یەکا نەوەک پسووتن
خۆش ئێستەیە جووت و ڕووت و قووتن

پێچان بوو لە یەک وەکوو دوو لاولاو
جووت بوون و بە تاق دەهاتنە بەر چاو

وەک شیر و شەکر لە یەکدی هاڵان
دز ویستی کە گەنج بەرێ بە تاڵان

پۆلووی گەش و سوور بە جۆش و پڕ تین
دامرکێ بە لوولە ئاوی زێوین

کلچۆکی* سپی و ستوور و سەر سوور
ڕێ تەنگ بوو بە گیرە گەییە کلتوور*
*کلچۆک = کلچێوک = دارێکی باریکی ڕەشە، گەورەکچان کلی پێ دەچاوان دەکێشن . بەڵام لێرەدا مانایەکی تری هەیە .
*کلتوور = کلدان= جێی کل ، جێی سورمەی چاوان. تورەکەیەکی بچووکە لە مێشن، یان لە کوتاڵ ساز دەکرێ. بەڵام لێرە دا مانایەکی تری هەیە .

لەم تەنگییە کوێرە مار بە سەد ڕەنج
زۆری سمی* تا گەیشتە سەر گەنج
*زۆری سمی = زۆری کڕاند، زۆری هێنا و برد.

دەردی دی هەتا گەیشتە ناوی
خەستاوی ڕژان لە تاقە چاوی

تێری بە گوڕی کوڕێکی کرمانج
بێ ڕێ هەڵەبوون*، گەیشتە ئامانج
*بێ ڕێ هەڵەبوون= بە بێ ئەوەیکە ڕێگا ون بکات.

یەک خۆی دەچکا لە گەرمی ڕێگە
یەک خوێنی تکا لە تەنگی جێگە

جەنگێ بوو دژی تیا شکا بوو
لەو ناوە دڵۆپێ خوێن ڕژابوو

حەو ڕۆژێ لە دەرهێنان ، لە تێنان
بەولاوە، شتی وەبیر نە دێنان

نە پشوو، نە وچان، نە خواردن و خەو
چەسپین بوو بە یەک، کە ڕۆژ بوو گەر شەو

جارجاره به هێمنی و لەسەر خۆ
دەبزووتەوە بەینی ناوک و ئەژنۆ

دەتگووت کە دوو زێڕگەری هونەروەر
لێکیان گرێ داوە جووتێ گەوهەر

زاوا لە بەیانی ڕۆژی هەشتێ
ناچار چووە دەر لە ناو بەهەشتێ

دیتی ئەوە (مەم) هەتا ئەوێستا
وێستاوە لە دەرکە شیر لە دەستا

پاسداری دەر و دەروونە هەر گا
گیانی لە دەسایە چاو لە دەرگا

(مەم) دیتی برای لە پەردە دەرهات
وا شاد بوو مەپرسە چی بەسەر هات

گەش بۆوە گرێی دڵی کراوە
پێی وابوو جیهانی پێ دراوە

یارت کە هەبێ دەبێ وەها بێ
گەر وانەبێ، کەڵک و سوودی نابێ

یارێکی بە ڕاستی گەر هەبێ پیاو
سەد خزمی بەدی* دەنێ دەپێناو
*بەد = خراپ ، بەکارنەهاتوو، بێ کەڵک.

****

## بەکر مەرگەوەڕی بۆ مەم تێدەچێنێ

دایناوە خودا کە ئەم جیهانە
بێ گیانی تیایە، یان بەگیانە

سەرپاکی بە ڕەنگ، بە کار و ئاکار
جیاوازە لە چەشنی نەخش و ساکار

عاسمان و زەوی گەڕیدە و سست
هێندێکی بە زیڕە*، هێند کڕ* و وست*
*بە زیڕە = بە قیژە قیژ ، دەم بە هاوار . * کڕ = بێدەنگ * .وست = بێدەنگ.

تاریکیی و ڕوونی ، کفر و باوەڕ
یان گەرمیی و سەردی و وشکیی و تەڕ

بڕوانە بەهەشت لە تەک جەهەننەم
ڕەش لای سپی جووتە، شادی و خەم

لێک دوورەوە بوون و پێک گەیشتن
زیندوو لە نەبوو، کران و کوشتن

ڕۆژ و شەوەزەنگ و سێبەر و تاو
با وو بژ و خاک و ئاگر و ئاو

ماڵدار و هەژار و تاڵ و شیرین
گریان و کەنین و شادیی و شین

پیاو هەن گوڵی سەر سەوەی* جیهانن
ئیوا هەیە پیس و دوو زمانن
*گوڵی سەرسەوە = گوڵی سەرتۆپ، مرۆڤی پڕبایەخ .

ئیوا هەیە ڕاست و چاکە خوایە
ئیوا هەیە خوار و ڕووسیایە

گشتی دژی یەک لە یەک خەریکن
لێک دوور و بەدەم لە یەک نزیکن

کاکڵ چییە ؟ لێک جوێن ئەمانە
شاراوە چییە لە ناو هەمانە ؟

تا یەک بە یەکێ بدا دیاری
یار دیاری دەکا لە کن نەیاری

هۆی دەردە دەزانی نرخی ساغی ؟!
هۆی بەفرە کە دۆستی مێرگ و باغی

دەس بەردە درێژ دەکێشێ بۆمان
با بێینەوە سەر وتاری خۆمان

میر لای هەبوو یەک بەدەرکەوانی*
ناوبانگی هەبوو لە دوو زمانی
*بەدەرکەوان = غولام ، هەس هەس و پاسەوانی بەردەرگا ، نۆکەر.

لە پیاوەتییا چرووک و ڕووڕەش
دڵپیس و لە شەرم و شوورە بێبەش

فێڵباز و بەراز و ڕق لە سینە
بەدخواز و نەساز و دڵ بە کینە

شەیتان و شۆفار و دەم دڕاو بوو
سەگ بێزی دەهات ئەوەند گڵاو بوو

ڕوو زەرد بوو درۆ لە ڕاست وتاری
سەرتاپێ گەماری لێ دەباری

خوێنتاڵ و دزێو، گەماڵ و سەر ڕەق
گۆڕی بوو نەچێتە دەر لەبەر شەق

دەست ڕژد و چنۆک و گونەکەر *بوو
بێ دۆست و قزە و نەزان و کەر بوو
*گونەکەر = تاوانبار، گوناح کار.

ڕووترش و گزۆک و گوێ نەبیستوو
گرژ و مڕ و مۆچ و کەس نەویستوو

بەدفەڕ بوو، بە گەڕ بوو، دەم گەوەڕ بوو
ئەو بیژووە (بەکری مەرگەوەڕ) بوو

تاژدین گەلێ دەیگەیاند لە میری
تۆ خاوەنی ناو و دەنگ و ژیری

کێ بخوزاێ کە خێوی نێوی چا بێ
زۆر شەرمە سەگێکی وای لە لابێ

چم وت؟ سەگی پاسدەری ئەمەگدار
بەدفەڕ دەبەری مرن هەزارجار

هەرجار لە وەڵامی پەندی تاژدین
ئەیگوت ئەمە* باشتری دەزانین
*ئەمە = ئێمە.

ئێمە وەکوو خێوی* ئاشی باشین
بەرداشی لە بەردی ڕەق دەتاشین
*خێو = خاوەن ، خواوەند ، خاوەند.

ئاشی مە هەمیشە سەربەخۆیە
بانیژە پڕی لە گاڵ* و جۆیە
*گاڵ = هەرزنە تاڵە .

پیسم دەوێ ئاشی وا بگێڕێ
هەر زمهەرێ بێتە بەر بهێڕێ *
*بهێڕێ = بیهاڕێ ، وردی بکا .

گوڵ چقڵی دەوێ کە پاسدەری بێ
گەنج ماری دەوێ لەبەر دەری بێ

ئێمە کە بە دەستەڵات و زۆرین*
جارێک سپیواش و زۆری بۆرین
*زۆرین = زۆردارین ، خاوەن دەست و دەستەڵات.

هەر نەرمی بەکاری ئێمە نایە
مەزنایەتی بانی دوو هەوایە

جارجارە یەکێ دەبەینە باڵا
زۆرجار گەلێ ون دەکەین لە چاڵا

جارێکی دروست و ڕاستکارین
سەد جارێ بە پێچ و لار و خوارین

تا یەک دەکرێ بە خانی خانان
زۆر کەس دەبێ ببنە تۆزی بانان

نەت بیستووە پیس بە پیسی دەڕوا
کارێکی نەبا* دڕوو نە دەڕوا
*کارێکی نەبا = فەلسەفەیەکی نەبوایە ، هۆیەکی تێدا بەستە نەبوایە.

دارۆغە ئەگەر نە زۆڵ و زاڵ بن
خونکار هەیە تووشی ڕۆژی تاڵ بن

ئەم کارە نە کاری ئێمەیە و بەس
سەی* پاسی هەیە لە دەرکی هەر کەس
*سە = سەگ، چوارپێ.

بڕوانە تەنانەتی خوداوەند
ئەم دەور و دوکانە چۆن دەکا بەند

تا پاکێ دەخاتە سەرزەمینێ
پیاو چاوی هەزاری پیس دەبینێ

بێهوودە بوو گفت و پەندی تاژدین
نەیتوانی لە میر وەکا پەڕۆی شین
*پەڕۆی شین = مەبەست لە عەیبەیە .

ئەو یانیگرەی بە کین و بەدبین
زۆر ترسی بە دڵ هەبوو لە تاژدین

نەخوازە کە جێ بڵیند بوو ئاوا
میر کردی بە یار و خزم و زاوا

وەک ئاگری گرتبێ وەها بوو
هەر مردبوو ڕەنگ و ڕووی نەمابوو

مەردی لە دڵانەماوی بێ پیر
دیتی هەل و، خۆی گەیاندە کن میر

دەرچوو لە دەسـ ـت بە هیچی ئەستی
تۆ چۆن دەبوو تۆزێ ڕانەوەستی

ئەو گەوهەری تانج و، تانجی گەوهەر
ئەو شۆخی بەناز و نازپەروەر

جوانتر لە پەڕەی گوڵی بەهاری
سەرتۆپی کچانی کوردەواری

چوی داوتە بە نۆکەرێک بە تاڵان
چۆن ناو دەبرێی لە گەورە ماڵان

سوڵتان دەبوو خوشکی تۆ بخوازێ
شا بایە دەبوو بە خۆی بنازێ

پێی گوت سەگی پیسی زۆڵی پڕکین
دوو چاوی منن مەمۆ و تاژدین

ڕۆژی شەڕەکەم دەگەڵ عەجەم دا
کاتێ کە سەرنجی ئەو دووەم دا

تاژدین لەبەرێک و مەم لە لایە
دوژمن هەموو کەوتە هەڵوەلایە *
*هەڵوەلا = پەشۆکاوی، شڵەژاوی ، تێکهاویشتن، دەست و پێ تێکەڵبوون.

دوو سەد عەجەمی بە تیر و پەیکان
بە کڵاوی زرێ و بە شیر و قەڵغان*
*قەڵغان = مەتاڵ.

دیل بوون بە دەس ئەم دووە بە تەنیا
ئەم دووانە چلۆن دەدەم بە دنیا

شا، کام سەگە تا ببێ بە خزمم
پێت وانەبێ هێندە پووچ و نزمم

سوڵتان ڕەگەز و بنیچە حیزە
ڕێی ناکەوێ خۆمی بێنمە ڕیزە

ئەو ڕێوییە دی بەڵا نزیکە
ڕووی گفتی گەڕاندە باری دیکە

گەورەم بژی هەر بە کامرانی
هەر خۆتی لە گەورەیی دەزانی

ژێردەستێ کە خۆت دەنێ دەپێناو
چاکەی دەبێ ون نەبێ لەبەر چاو

پێویستە ئەمەگ ببێ لە گۆڕا
کەس نەبوەتە یاری کەس لە خۆڕا

بۆ تۆ کەسێ تاڵ و سوێری نۆشی
شیرینکە دەمی لە ڕۆژی خۆشی

چووکەش دەبێ شوێنی خۆ نەگۆڕن
وەک پێشوو لە خۆ و لە تۆ بنۆڕن

با بادی هەوا نەبن بە جێگە
بۆ فیکەیە دەرنەچن لە ڕێگە

دژوارە نەدی و بدی* نەگۆڕێ
سەرئاو دەکەون بە تاقە چۆڕێ
*نەدی و بدی = هیچ نەدیوی پێداکەوتوو، لە (ندید بدید)ی فارسی وەرگیراوە .

تاژدین کە ئەمەی لەگەڵ کراوە
لەو ڕۆژەوە شۆی لێ هەڵکێشاوە *
*شۆ لێهەڵکێشان = پێ لە بەڕەی خۆ دەرهاویشتن .

گرتوویەتە دەم لەلای ئەم و ئەو
(زین) هی منە دەیکەمە ژینی مەم

ئەی بۆچی گوتی و لەمەی نەپرسی ؟
وا دیارە لەمن نەماوە ترسی!

گەورەم وتی لاوە نۆجوانە
میرزادەیە، شێرە، پاڵەوانە

هەرچی بڵێ دەسبەجێ ڕەوایە
ترست پێ بمێنێ لەو هەوایە

هیوای بەشە تاج و تەخت لە تۆ کا
میر لەو وتەدا شڵەژا پەشۆکا

نیازم بوو گوتی، کە (زین)ی (مەم) بێ
پێم خۆش نەبوو بەخششی وی کەم بێ

وا سوێندێ دەخۆم بە گۆڕی بابم
تا من لەسەر ئەم زەمینە مابم

نێرینە لە ڕێچەڵاکی ئادەم
کێ لێمی بوێ بە مێردی نادەم

هەرکەس لە سەر و گیانە بێزار
وا (زین)! و ، دەبا ببێتە کڕیار

کێ قەڵس و وەڕەز بووە لە ژینێ
بخوازێ لە دەستی ئێمە (زین)ێ

خونکار وەکوو ئاگرن دەر و ژوور
وا باشە توخن نەبین بە هیچ جوور

ڕەنگیان گەشە وەک پەڕەنگ و پۆلوون *
دڵیان ڕەشە وەک خەڵووز و کۆڵوون *
*پۆلوو = پەرەنگ ، سکڵی ئاگر . * کۆڵوو = لەتکە نانی دە تەندوور کەوتووی سووتاو

زۆردار کە برا و کوڕ و کەست بێ
چیت لێ نەوێ، دووری ئەو بەست بێ

نەخوازە کە پیسی لێ وەکۆ بن
وەک بزنی بەدەم* لە ناو چڕۆ* بن
*بزنی بەدەم = بزنی هەراشی زۆرخۆر . * چڕۆ = وەچەی نەوڕەسی دار و درەخت و گژ و گیا .

بۆ خواردن و بۆ کرۆسنەوەی خۆ
بەر سم دەدرێ هەزاری وەک تۆ

****

## گریان و بێقەراریی زین بۆ مەم

تاژدین و ستی بە یەکدی شا بوون
لەو بەندی جودایەتی جودا بوون

بێ یار و هەواڵ لە گۆشەیی خەم
بۆ دەردی جودایی مایەوە مەم

دڵسۆزێ نەبێ ببێتە هاودەم
هەر ڕۆژێ بە ساڵ دەچێ دەمی خەم

زین تا ستی لابوو، هەیبوو ئارام
ئەم شێتی ئەوینە بەو دەبوو رام

تاژدین ـ ێ هەبوو مەم ـ ی دەلاواند
چوونی گڕی گرت و جەرگی تاواند

دابەش ببوو خەم لەناو هەماندا
دووی خۆش، بەشی خۆشیان بەمان دا

ئەو شاد و ئەوان مەکۆی خەمان بوون
دامان دوو، کە ئەو دوو دەمدەمان بوون

وەک هەوری بەهارێ چاوی زین ـ ێ
فرمێسکی دەڕشت لە ڕێی ئەوینێ

گریان بوو بە ڕۆژ و ناڵە بوو شەو
چل ڕۆژێ بڕا* لە خواردن و خەو
*بڕا = جیا بۆوە، دوور بۆوە ، تەوەللا بوو، بەری بوو.

خوێنی دڵی مایەیی ژیان بوو
ئاو بۆچییە، ئاوی چاو ڕەوان بوو

دڵتەنگ بوو لە چەشنی زاری تەنگی
ڕەنگی مەمی* زەردی پەڕیە ڕەنگی
*ڕەنگی مەمی = ڕەنگی مەمکۆڵە زەردەکانی کەوتە سەر ڕەنگی ڕوخساری.

وەک مووی کەمەری لەشی بوو باریک
ڕۆژی وەکوو پرچەکانی تاریک

چەند تایەن و دۆست و هاونشینان
هاوڕاز و نیاز و نازەنینان

دڵیان بوو بە ئاهی سەردی بریان
ویستیان بەسی کا* لە شین و گریان
*بەسی کا = کۆتایی پێ بێنێت، تەواوی کات ، بیبڕێتەوە.

گوتیان کە بە ئاه و ناڵە ناڵت
ڕۆژی مە ڕەشە لە ڕەنگی خاڵت

بەس بگرە بە ئاوی چاوی کاڵت
کاڵ بوونەوە کوڵم و لێوی ئاڵت

جا چبووە لە تۆ بڕاوە ئەستی ؟
داخوازی دڵی گەیشتە دەستی

ئەو وایە خەریکی بەزم و خۆشی
تۆ بۆ کەسەر و زووخاو دەنۆشی؟

تۆش خۆش بە بەوەی کە خۆش و شادە
وەک پرچی بڵاو خەمان بەبا دە

ها شەو، شەوی پرچی سەر وەبەر خە
لاجانگی هەواڵی مانگ وەدەر خە

کێشیان بدەوە برۆی کەوانت
هەڵ بێتەوە مانگی نێو چەوانت

هەڵیان بڕەوە مژۆڵی دڵ بڕ
سەد دڵ ببڕە بە نیوە ئاوڕ

نازان بدەوە بە چاوی مەستت
زەردەی بە دوو لیمۆی کەس نەگەستت

بەو خەندە کە خونچە پێی دەپشکووت
تێراو بکەوە پەڕەی گوڵی ڕووت

دەوری دە بە بسک و پرچی پڕچین
شەوبۆیە* لە گوڵ بکە بە پەرژین
*شەوبۆ = گوڵی شەوبۆ.

هەر بسکێ سەری گەیاندە گۆنە
کەرتی بکە لێی مەپرسە چۆنە

بسپێرە بە تیپی وردە خاڵان
با گیانی کوڕان بەرن بە تاڵان

با بێ بەزییت بە بولبوڵانت
هەڵبێنە تەرەی لە سەر گوڵانت

خۆش پێکەنە با هەزار دەستان *
دەست پێکەنەوە بە بەند و بەستان
*هەزاردەستان =هەزارداستان = بولبول.

با هاڕە بگاتە گوێ لە گواران
پیتێ* بدە تیپی شێت و هاران
*پیت = بەهرە ، قازانج ، خەڵات.

سەرخۆشکە هەزار مەلا بە نازان
سەد پیرێ بنێرە بەر بەرازان *
*پیری بەر بەرازان = ئاماژەیەکە بە شێخی سەنعان، کە بە پیرانەسەر بۆ یارەکەی پشتی دە شێخایەتی کرد و بوو بە بەرازەوانی باوکی حەزەکەی .

تێیان بگەیەنە گێژ و کاسن
بییان هێنەوە ڕێگە، ڕێ نەناسن

چاو بەستوو چلۆن دەبینێ ڕوونی
بوونیان بە خەیاڵ چییە؟ نەبوونی

تا دوور لە جوانیی و ئەوینن
با تێبگەن ئەو نەدینە، دینن*
*دین = شێت.

گومڕان لە جوانی، بەش بڕاون
دڵیان کەڕ و کوێرو دەم دڕاون*
*دەم دڕاو = زار بە هاوار، دەم هەراش ، دەم کوێخا.

وەک گوێرەکە پەت پساو لە دەشتا
بێهۆش دەگەڕێن بە شوێن بەهەشتا

بت بینن و ڕێ لە خۆ نەگۆڕن
بۆ نەخشی خودا لە ڕووت بنۆڕن

بێهوودە بوو پەندی وان لە زین ـ ێ
هەر نەیشی دەبیست لەبەر گرینێ

دڵداری لە ڕێزی ئاگرایە
سەرکۆنەیی باوەشێن و بایە

هەرچەندی بەسەر ئەوا دەهاتن
ئەم بیری دەکرد لە ڕێی هەڵاتن

فرمێسکی هەلی نەدان بە چاوان
ڕێ بینێ لە ناو بچێ بە تاوان

هێند زۆر بوو هەنیسک و ئاهی سەردی
نەیتوانی شتێک بڵێت لە دەردی

وایان دی ئەوانەی پەندگۆ بوون
بێهوودەیە لەم هەژارە کۆ بوون

بیریان بۆ بەرێ لە تاوی ئەستی*
دەگری، چووە هاودەمی لە دەستی
*بیریان بوو... = ئەوان پێیان وابوو گریانی زین لە دەردی دووریی ئەستی یە .

ڕوون بۆوە کە ئەم گریان و شینە
پنج و ڕەگەزی لەسەر ئەوینە

وا دەردی دەروونە گێژی داوە
ناچار هەموو کردییان بڵاوە

زین مایەوە خۆی تەنێ دەگەڵ خەم
هەر خەم دەمی وا دەبێتە هاودەم

****

## زین دەگەڵ پەژارە دەدوێت

ئەیگوت بە خەم ، ئەی هەواڵی ژاریم *
فریاڕەسی زام و دەردی کاریم
*ژاریم = پەرێشانیم.

پۆشاکی نەدار و خاکەساران
خۆراک و بژیوەکەی هەژاران

هاوڕاز و نیازی دەردەداران
هاودەنگی نەخۆش و لەش بەباران

پێخۆری لەبەر دەمی گەدایان
هاوپیاڵەیی کۆڕی بێنەوایان

دڵدارە بە تۆ دەگاتە دڵبەند
دەروێش دەبەیە نزیک خوداوەند

تۆی لێ نەبی دڵ وێرانە ماڵە
بیابانێکی قاقڕ و کڕاڵە *
*کراڵ = چۆڵەوانی، بیابانی وشک و بێ ئاوەدانی .

لێی دەرمەکەوە دەری ببەستە
هی خۆتە کلیلەکەت بە دەستە

خەم بۆیە بەنرخە، بۆ هەواڵی
جێت نایەڵێ یارە ڕۆژی تاڵی

شادی چییە؟ یاری جاری خۆشە
خەم دۆستی دڵی کز و پەرۆشە

خەمخۆری کە نەکرێ لەم جیهانە
تێکچوون بەشی هەرد و عاسمانە

دڵ هۆگری تۆیە ئەی خەمی دڵ
بێ گەنجی تۆ، دڵ چییە؟ کەمێ گڵ

جارجارە کە زۆر دەکەوتە پەستی
بە گلەییەوە ڕووی دەکردە ئەستی

ئەی هێزی گیان و تیشکی چاوم
فێنکاییدەری گڕەی هەناوم

هاو هێلکە و هاو هێلان و هاو نوێن
هاوباڵ و پەڕ و ڕەگ و دڵ و خوێن

هاو شادیی و هاو نیاز و هاو ناز
هاو گاڵتە و بازی، یار و هاوڕاز

ئاکاری مە وەک یەکە، بەڵان* بەخت
بۆ تۆ شلی گرتووە بۆمن سەخت
*بەڵان = بەڵام.

بۆ تۆ دەسەمۆ، لەمن چەمووشە*
بۆ تۆ گوڵە بۆمە دڕک و پووشە
*چەمووش = یاغی، یانیگر، کێوی و نامۆ.

ئەستێرەیی تۆ هەڵاتووە* گەش
بۆ بەختەوەریت نە بۆمە هاوبەش
*هەڵاتووە = دەرکەوتووە، هاتۆتەدەر، وەدەرکەوتووە.

لەو خودایە گەلێک سوپاسگوزارم
لەو بەختە ڕەشەم نەبووی بە یارم

چارم چییە خوایە بۆم دەنێرێ
کێی وایە بە بەختی ڕەش بوێرێ

تاژدین بەشی تۆیە شادی هەردەم
ئەمنیش بەشی خۆم هەیە خەم و مەم

چۆن مەم بە هەواڵی خەم دەزانم
پێم خۆشە کە هاودەمی خەمانم

****

## زین مۆمی داگیرساو دەدوێنێ

جارێکی بە زاری* مۆمی دەدواند
دەردی دڵی زاری ژاری دەنواند
*بە زرای = بەدەم گریانەوە ، بە گریانەوە.

ئەی هاودەمی ڕاز و هاونشینم
من، تۆش وەکوو خۆم بە سۆز دەبینم

فرمێسکێ لە گەڵ منا دەڕێژی
چۆن وا دەبێ هیچ شتێ نەبێژی!

نازانی دڵم بە خۆم دەمێنێ
یەک بگری لەگەڵم و نەمدوێنێ ؟

دردی من و تۆ لە یەک جودایە
وەک خاوەر* و زەردەپەڕ وەهایە
*خاوەر = ڕۆژهەڵات، خۆرهەڵات.

تۆ خاوەر و شۆق دەدەیتە چاوم
من ڕۆژپەڕ و ئاگرین هەناوم

ناسووتێ لە تۆ مەگەر زمانت
وەک من نییە بسووتێ تای ژیانت

شۆقت کە لە سەر سەری دیارە
سەوداگەری سەرسەری* دیارە
*سەرسەری = وازی وازی، ڕاڕا ، هەردەم لەسەر هەوایەک .

من گیان بە بڵێسە، دڵ بە پشکۆم
سووتاو جگەر و، هەناسە بۆسۆم

تیشکی سەری تۆ، لە تۆ زمانە
گڕپەی دڵی من بە ئێش و ژانە

هی من، بە لەهی* و بە گێژەڵووکە
ناکوژێتەوە، هی تۆ چووک و سووکە
*لەهی = سێڵاو، لافاو، شێڵاو، لێشاو.

شەو دەبییە هەواڵی شەوبێداران
ڕۆژانە دەنووی هەتا ئێواران

من ڕۆژ و شەو و سبە و ئێوارم
یەک لانییە، ئاییسانە کارم

جارجارە لە دەست دڵی بریندار
جاڕز لە ژیان دەبم ، بە ناچار

پەڕوا* نەدەما لە ئاگری خەم
پەروانە دەما ببێتە هەودەم
*پەڕوا = خولیا ، کەلکەلە.

****

## زین ڕووی گفتوگۆی دەکاتە پەروانە

باڵداری هەژاری شۆخ و ڕەنگین
دڵداری بە دەرد و ئێش و خەمگین

ئەی سەروەری هۆزی سینە داغان
ڕێشاندەری مەرگی ڕاست و ساغان

مەردانە دەبەخشی گیان لە ڕێی دڵ
هەر تۆی کە لە مردنێ نەکەی سڵ

لەو ڕێگەیە خێوی نێوی بەرزی
داخم! کە دەچیتە بەر، دەلەرزی

ناوێستی گەلێک لە ڕێی ئەوینێ
هەر کاڵی دەڕۆی لە ڕووی زەمینێ

زۆر شەرمە پەلەی دەکەی ئەوەندە
لەرزینەکە تۆزێ ناپەسەندە

خۆ ڕانەگری لە کاتی تاڵی
مەرگت بوێ، پوختە نیت و کاڵی

دڵدار نەمرە لە ڕووی زەمینێ
کەی سووتن و مردنێ دەبینێ!

گەر پوختە ببن لەڕێی ئەوینێ
کاتێ دەمرن دەکەونە ژینێ

لەشیان کە نەما گییانی پاکن
بەم بۆنەوە بێ گومان و باکن

هەرچی کە دەدیت دڵی دەبزواند
دەت دی کە هەموو شتێکی دەدواند

تەنیا لە کەسانی پیس و ناڕاست
نێوانی دەگرت و خۆی دەپاراست

لە زمان شڕی، دوو ڕوو، بەدگومان بوو
هاوڕازی هەمیشە بێ زمان بوو

سەرتابەپێ نوقمی گۆمی خەم بوو
ژینی هەموو بۆ خەیاڵی مەم بوو

****

## سووتانی مەم لە دەردی دووریی زین ـ ێ

مەم زۆرتری زین ـ ێ دەردەدار بوو
خەم لەم کە یەکێ بوو، لەو هەزار بوو

ڕەنگ زەرد و بە دەرد و بار لە لێوان
دێوانە و شێت و، دایە کێوان

پەتیارەیی وای لەسەر ببوو زاڵ
ئارامی نەما لە شار و ناوماڵ

وای گرتبوو ئاگری کڵی دڵ
چاوی بە یەکی دەدین گوڵ و گڵ

دووی تینوو لە دەست و دەر لەبەر تاو
بێهێز بکەون لە تاو قومێک ئاو

لەپڕێکی بە تاوی ئاوی ژیانێ
داباری لە هەوری عاسمانێ

یەک چۆنی بوێت هەڵێنجێ بۆ خۆی
یەک تاقە دڵۆپەیەک نەچێ بۆی

یەک ژینی نەمر بخاتە بن دەست
یەک بمرێ هەتا هەتایە بێ هەست

تاژدین کە نیازی هاتە بەر دەست
ئەو ڕۆژە گیانی مەم گڕی بەست

برژابوو بە ئاگری ئەوینی
گریان بوو بە دۆست و هاونشینی

دڵخۆشی لەبیر نەما کە چۆن بوو
لاوێنی لەلا شتێکی کۆن بوو

کاتێ کە دەهاتە بەردەمی میر
وەک بەندیەکی بە کۆت و زنجیر

دڵ گەرم و هەناسە سەرد و بێ ڕەنگ
دیوان هەموو لە سوێیانی دڵتەنگ

جارجارە کە دەچوە ماڵی تاژدین
بێچارە لەبەر گرین و ناڵین

مەودای نەبوو دەردی دڵ ببێژێ
باری دڵی ژاری هەڵ بڕێژێ

ناچار دەبوو دەرکەوێتە دەم چەم
دەیدواند و لە خۆی دەکردە هاودەم

****

**پەیڤینی مەم دەگەڵ چەمی دیجلەدا**

دیجلە چتە هێندە بێ وچانی
وەک ئاوی دوو چاوی من ڕەوانی

تۆش وەک دڵی ئێمە پڕ شەپۆلی
تۆش هۆگری دەشتی چۆل و هۆلی

شێتی وەکوو من بە پێچ و گێژی
هەر ناڵەتە هاتەران دەبێژی

وەک من نە پشووت هەیە نە وەستان
تۆش داوتە دڵت بە دیدە مەستان ؟!

کێت هێندە لەناو خەیاڵ و بیرە
گرتۆتە هەمێزی خۆت جزیرە!

ئەم شارەیە گەر نیاز و دڵخوات
خۆشبەختی، گەیشتوویت بە ئاوات

جەرگەی دڵی تۆیە نیشتمانی
هەردەم دەگەڵی دەسەوملانی

دڵخۆش بکە، بەسیە داد و زاری
لەو خوایە بکە سوپاسگوزاری

شێتی کە دەمێ بەجێی بهێڵی
بەغدا چییە؟ تۆ لە شوێنی وێڵی!

بەهرەی منە گریە و هەناسە
دروارە بە بەژنم ئەو کراسە

جارێک بە دڵی منا ببوورە
با بزانی کە دۆژەهیش* چ جوورە
*دۆژە = جەهەندەم ، جەحەندەم.

سەرچاوەیی چاوی من ببینە
خوێناو دەڕژێ لە گۆلەشینە

بۆ دەردی دڵم کە دوورە چارە
چاو بۆچی ؟ بەچی هومێدەوارە ؟

وەستانەوە نێرگزان و سەقڵان
دەروازە و هۆمەران و مەیدان

سەیرانگەهی تۆن و لێی دەکەی گەشت
من ماوم و هۆگری چیا و دەشت

****

## ڕووی وتاری دەکاتە شنەبا

هیچی نەدەگوت کەسی دەگەڵ با
ئاخافتنی بوو تەنێ دەگەڵ با

ئەی ناسکی نادیار وەکوو گیان
پەروەردەیی تۆن هەچی گوڵ و گیا ـ ن

ڕێگەت هەیە بچییە لای هەموو کەس
هیوامە کە گیر نەبی دەمەودەس

نامەم بگەیێنە کۆشکی یارم
بە گرانی مەزانە دەردەدارم

کۆشکی بەڵەکە و مەزن نشینە
شازادەیی کورد ببینە زین ـ ە

پێشان کە دەچی بە چاپوکانە*
ماچی بکە دەرک و سەردەرانە
*چاپوک = چالاک ، زیرەک، ئازا.

کاتێ کە دەگەیتە ڕووبەڕووی یار
سەر دابنەوێنە بۆ گەلێ جار

ڕووی تێکە بە هێمنی و لەسەرخۆ
تای بسکی نەلەرزێ با لە بەر تۆ

ڕاوەستە لە پێشی دەست بە سینە
خۆشی لە تۆ ! تێر گوڵم ببینە

کوڵمی مەدە بەر گڕی هەناسان
زۆر ناسکە، با نەبێ هەراسان

نووسراو که به خوێنی دڵمه ڕەنگی
لێکی بدەوە سووکێ، بیدە چەنگی

گەر خوێندییەوە کەم لە دەم بنۆڕی
ڕاسپاردەیی چابە، دڵ نەگۆڕی!

لە زمان منەوە بڵێ بە زاری
ئەی ڕۆژی بە تیشکی کوردەواری

سەرچاوەیی ئاوی ژینی لاوان
ڕووناکیدەری گلێنەی چاوان

جوانتر کر و ڕەنگی دەستی یەزدان
وێنەی تۆ لە کامە باغ و ڕەز دان ؟

پەسنت چ بدەم ئەوەندە جوانی
وەک هەرچی بڵێم جوانی، وا، نی

ئەی شاهی جوانی، پادشایان
وا باشە لە بیر نەکەن گەدایان

تا دەرچێ بە دادپەرستی ناوت
بیانکوژە بە تیلی مەستی چاوت

لە گوناهی هەژاری خۆت ببوورە
لێم ڕوون نییە گەرچی ئەو چ جوورە

هەر هێندە هەیە دڵێکی من بوو
ڕۆژگارێ لەلام بوو ئیدی ون بوو

گوایە پەری دەستی لێ وەشاندم
تای ژینمی بڕی و دڵی ڕفاندم

کاتێ لە گەڵم هەواڵ و جووت بوو
زۆر بادی هەوا و بە شات و شووت بوو

لاسار و بزۆز بوە دیارە
گش کەس بەشی خۆی گوناهبارە

بۆ دانەیی خاڵ چوو کەوتە داوا
گیراوە لە بەندی بسکی خاوا

هەرچی لە گەڵی بکەی ڕەوایە
بمبوورە کە بۆی دەکەم تکایە

بیبەخشە گەلێک نەزان و خاوە
بەو پرچە ڕەشەت پەنای هێناوە

بەخشینی گوناه هەچەند کەمیشە
بەخشەندەیی خۆشترە هەمیشە

ئەی سروەیی نەرم و پاک و خاوێن
بە سپایی هەڵستە ماچ کە داوێن

تۆ خوا شنە کاتێ دەردەچی و دێی
بۆم بێنە کەمێک لە تۆزی بەر پێی

تۆزێ کە لە سۆلی* ئەو سواوە
دەرمانی دڵە و سۆمایی چاوە
*سۆل = پێڵاو، کەوش.

****

**مەم سەرکۆنەی دڵی خۆی دەکا**

جەنگێ بوو چەلێک دەگەڵ دڵی ژار
ئەی ناکەسی پێ نەزانی لاسار

تۆ دڵمی دەگەڵ منا نەیاری
دات ناگرێ شەرم و شەرمەزاری ؟

بۆ کوێ چوو ئەوەندە سوێند و پەیمان
خۆت چووی و هەزار گوتەت لە پەیمان

هیچ بێ ئەمەگ و نمەک وەکی تۆ
هەرگیز نەبووە و نییە تەکی تۆ

بێ گفت و بەڵێنی چەوت و چێڵی
بڕیار ئەوە بوو بەجێم نەهێڵی

دەتگوت کە دەگەڵ تۆ ڕاست و پاکم
ئازام و بەدوور لە ترس و باکم

ئەی بۆچی لە بەر ئەوین هەڵاتی ؟
ئەی بۆچی دەڕۆستی* خەم نەهاتی ؟
*دەڕۆست = باشار ، بەرگە ، تواناهێنان، زەفەربردن.

بۆ خۆشیی و شادییان هەواڵ بووم
نام ناسی کە تووشی ڕۆژی تاڵ بووم

بڕوانە گییان چ مەرد و ڕەندە
بێ هێز و زەبوون و کز ئەوەندە

جێگیرە لە گرتووخانەکەی لەش
شاییم چ بە تۆ بێ ئەی دڵی ڕەش ؟

تۆ چۆن دەبوو گیان بەجێ بهێڵی
گیانت نەبێ پارچەیەک لە سێڵی *
*سێڵ = ساج.

زیندوویەتی تۆ لە پیتی گیانە
ڕووناکی زەوی لە عاسمانە

بێ مۆم و چرا چلۆن دەوێری
تاریکییە ڕێی نەزان و کوێری

بۆ یار دەچی؟ یار لە ناو گیاندا
هانای بەرە بەر، کە پێت نیشان دا

تۆ ئاوێنەیێکی ڕوو نوێنی
گیانت کە لەبەر نەبێ چ دێنی

لێی دوور مەکەوە دەسم بە دامان
هیچ ناکرێ پاشەڕۆژ بە دامان

هەر دەرچی لە ڕێگە نایە سەر ڕێ
چاری سەری خۆت کە، چاری دەبڕێ

پێ مەبڕە لە دەرکی ئەو بە هیچ جوور
تا باڵ نەشکاوە بفڕە بۆ ژوور

بۆ کوێ دەچی، چیتە؟ بۆچی ون بووی ؟
یادت نییە تۆش بەشێک لەمن بووی ؟

خۆت ون مەکە تۆ نەگێژ و کاسی
خۆ ناس بکە تا خوداش بناسی

پێت وایە بەبێ مە چوویە لای گوڵ؟!
گوڵ لای منە، تۆ گەیی بە پێکوڵ *
*پێکوڵە = دڕوویەکی چەند قولاپەیە.

بەژن و کەزییەکەت لە تۆ دیارە
ڕاکێشت دەکاتە پای قەنارە *
*قەنارە = سێدارە.

چی وێڵی لە شوێنی ئەو خەیاڵە
بۆ یار دەگەڕێیت و یار ماڵە

بڕوایی مەکە بە وردەخاڵان
ماڵت مەدە زەنگییان بە تاڵان

پەیوەند مەکە خۆت بەداوی بسکان
بەس بۆ دەم و لێو بدە هەنیسکان

زەرتووشت دەپەرستی ئەی بەڵاگر
نێزیکی بەسە دەکەویە ئاگر

چەشنی تۆ هەزار مەلی بریندار
شینگێڕی بکەن بە داد و هاوار

من چەشنی پەپوولە دەبمە قەقنەز
تێ ناگەیەنم لە ڕازی خۆم، کەس

ئەی دڵ دەتەوێ لە خۆشیا بی
تا وابی هیوات نەبێ کە چابی

پرسیم لە پزیشکی ژیر و چازان
بۆ تۆ !وتی: داخ و دەردە دەرمان

پارێزێ بکەی لە خێر و خۆشی
شیرین بڕژێنی تاڵ بنۆشی

چیت ئارەزووە زیانە بۆ تۆ
خەم چارەتە، ژاان ژیانە بۆ تۆ

هێند دەردی دڵی لەکن دڵی گووت
بەو خاکەسەرە دڵی، دڵی سووت

وەک ئاگرێ بەر بدەیتە هەژگەڵ *
دایگرتە چڕەچەمان* و دووکەڵ
*هەژگەڵ= پڕ و پووش،قەسەڵی وشکی گەنم و جۆ و گەنمەشامی و ...
*چڕەچەمان = ئاگری بە گڕ و دووکەڵی زۆر .

قورمی ڕەشی خستە ژێر مەڵاشوو
مێشک و سەری ئاخنی تەپ و دوو *
*تەپ و دوو = دووکەڵ و تەپ و مژ.

ئاوێنەیی ڕوونی هۆش و ژیری
وا لێڵ بوو چ شت نەما لە بیری

وەک هەورە ڕەشێکی سەربەخۆ بوو
هەواراز چوو، لە عاسمان وەکۆ بوو

خوێناوی هەناو و چاوی پڕ تەم
داباری بە ڕێژنەیەکی کەم کەم

تەرزەکوتی وردی جەرگ و سی هات
لەم شەستە ڕەهێڵە دا لەهی *هات
*لەهی = سێڵاو، لافاو، شێڵاو، لێشاو ...

لافاوی لە دەردی دڵ هەڵستا
(مەم) پێی نەدەوەست* و پێی نەوەستا*
*پێی نەدەوەست = باشاری نەدەهێنا. * پێی نەوەستا = پێی ڕانەوەستا.

پێت وابوو کە دیجلە و فوراتن
جەیحوون چووە پاڵ و هەرسێ هاتن

هەرچەندە بە شینی *ئەو ئەویندار
شین بوو لە دەم ئەم چەمە سپیندار
*شین = شینگێڕی، گریانی بەردەوام.

ئەو دەشتە ببوو بە باغ و گوڵزار
تا چاو بڕدەکا هەمووی گوڵ و دار

ئەو بولبولی هێندە ئارەزوومەند
بەندی لەشی لێ ببوو بە پێوەند

توولی ڕکە* لێی وەراند پەڕ وباڵ
پۆشرابوو بە مووی سپی سیاچاڵ
*توولی ڕکە = داری قەفەس، شووڵی قەفەس.

باڵای وەکوو سەوڵی بۆ کەوانی
ئاوا ببوو مانگی ناوچەوانی

سەرکوڵمەیی سێوی زەردی بێ بۆن
شوێن داخی لە ئاوی چاوی لێ بوون

وا ببووە شەڵاڵ لە ئاو و خوێنا
ئاوێنەیی ڕەنگی ژەنگی هێنا

چی تین و توان و هێز و بیر بوون
هەڵیان نەدەکرد و لێی زویر بوون

چل ڕۆژ و شەوان کەوت لە دەم چەم
زیندوو بوو بە دەم، بەڵام بە حاستەم

****

## دەرچوونی میری بۆتان بۆ ڕاوی نێچیر

نێچیرگری دەنگ و باس و خواسان
وا ڕیزی وتاری خۆی دەدا سان

ڕۆژی هەڕەتی بەهار کە خۆشی
دار و دەر و بەرد و هەردی پۆشی

بە گیا و گوڵ و چڵووکی بەگڵووک
ڕازاوە جیهانە پیرە وەک بووک

هەر یەک لە نواڵ* و کێو و دەشتێ
بووبوونە بڕەو بەری بەهەشتێ
*نواڵ = نواڵە = جێگای نیسار و تاونەگر لە چیا دا.

هەر باخچەیە وەک بەهەشتی گەورە
سەرچاوەیی ئاوی ژین لە دەورە

هەر کێوە لە جووری کێوی تووری
مووسا دەبوو پا پەتی، ببووری

هەر چۆمە لە چەشنی هەژدیهایەک
هەر داری بە زاری خۆی خودایەک

هەر سوورە گوڵێ گڕێکی بێ تین
هەر چیمەنی شین و شادی بێ شین

چی بولبولە کردبوویە گاڵە
هەرچی مەلە ببووە هاوپیاڵە

گاکێوی و ئاسک و مامز و گۆڕ*
کەو، قاز و قورینگ و کۆتر و پۆڕ
*گۆڕ = کەرەکێوی.

گەلگەل دەچڕین لە کێو و شاخان
پۆل پۆل دەفڕینە مێرگ و باخان

ئەو کاتەیە باوی گەشت و ڕاوە
هەرکەس کوڵی دڵ دەنێتە لاوە

فەرمانی سەرۆکی کوردەواری
وابوو کە بەیانی خەڵکی شاری

گش خورت و جوان و پیر و لاوێ
با بێن لە گەڵم بچینە ڕاوێ

زوڕنا و کەڕەنا و دەهۆڵ و دمبەگ
بێنن هەموو، بێن بە چەک چ بێ چەک

نێرینە بمێننەوە لە ماڵان
ماڵ و سەرییان دەدەن بە تاڵان

ئامادە بە چەک ئەوانی بوویان
هەر کون دەبەیان نەبوو هەموویان

کۆبوونەوە گشت لە دەوری شارا
ڕووت و بە شمەک، هەژار و دارا

پێخواس و بە کەوش و میر و ئاشێڕ*
سەربەرز و نەوی و بەپێ و شەل و گێڕ
*ئاشێڕ = ئاشەوان، خاوەن ئاش.

هێندێک چەکەچەک* بڕێک بە پڕتاو
بەو بەزم و هەرایە گەینە جێ ڕاو
*چەکەچەک = بە لۆژە لۆژ، بە هێواشی، نەرمە نەرمە ڕۆیشتن.

دابەش بوو شکار لە ماە* و زەنوێر
جێ لەق بوو ورچ، ڕەوین گۆر و شێر
*ماە = نوچکە و تیشی زۆر بەرز و لووسی شاخ.

هەو هەو گوڕە گوڕ بە چەشنی هەوران
پێی تۆقی دڵی پڵنگ و بەوران

بەگزادە و پاڵەوان و سەردار
هی گورزگران و سووکەڵە سوار

دەگرن سەری کێو و دەشت و قەدپاڵ*
دەکوتن دەجنن بە گورز و گۆپاڵ
*قەدپاڵ = لایاڵی شاخ، خوارداوێنی کێو.

دەگرن دەدڕن وەزیر و میران:
ئاسک بە کەمەند و شێر بە شیران

تاژی وتولە پێش بە پێشی پێڕەو
ڕاوێچکە* دەکەن کە هەڵفڕن کەو
*ڕاوێچکە = هاتن و چوون...

دەگرن بەرەگە بەباز و تەرلان
کەروێشکی وەدەر دەنێن لە سەر لان

ژێ دەکشن و تیر بە گەل دەهاوێن
باڵندە دەکەونە دەشت و داوێن

کێ دێ بەزەیی بە بێ زمانان
دەمرن، دەمی بەزمە بۆ مەمانان

ئەسپی ڕەسەنی حدوودی گوی پەل
گرتییە خەنە کلک و یاڵ و چوار پەل

با کێشەوە کەن لە گۆشت هەژاران
ساغان بە خوڕا بەرن سواران

ئێوارە کە هات و ڕاو بەتاڵ بوو
دڵخۆش هەموو لایە ڕوو بە ماڵ

****

## باغەکەی میری بۆتان ـ ێ

میر بووی لە تەنیشتی کۆشک، باخێک
چۆن باخ؟ لە دڵی بەهەشتێ داخێک

تانجێکی گوڵان لە سەر جیهانێ
دار چوو بوو سەری لە عاسمانێ

باڵندە ئەوند بوو لەو بەهەشتە
ڕاست ببووە بەهەشتی پڕ فریشتە

کاژ دەستەملان لەگەڵ سنۆبەر
نێوان بوو لە نێو چنار و عەرعەر

نارنج و بەهێ لە ڕەنگی (زین)ێ
زەردی کەسەر و کوڵی ئەوینێ

خورما و هەنار و سێوی داران
لێو و مەم و کوڵمی نازداران

شەوبۆ و وەنەوشی تازە دەرچوو
لای پۆلەگوڵێکی کات بەسەر چوو

گوڵ پیاڵەیی گەوهەری لەسەر چنگ
سەر ڕێژ لە تنۆک تنۆکی ئاونگ

دێراوە ڕەزی تەکووزی ڕێز ڕێز
گیرابوو لە کەسک و سوور، پەراوێز

پێت وابوو ستێرەناسی زانا
ساڵ پێوی لە واندەرانە دانا

دەت دی هەموو شوێن و چاوەچاوە
شینایی لە ناوە، ئاوە دەوری داوە

هێرۆی ڕەش و سوورگوڵی شەق و گەش
لاسا بوو لە خۆش دڵ و لە بەختی ڕەش

****

## ژوانی زین و مەم لە باخی میر دا

ئەو ئاسکی نچیری ڕاوکەری خەم
چاو سوور و تەڕی نەدیتنی مەم

ئەو تازە نەمامی باخی جوانی
سیس و کزی دوور لە باخەوانی

پێوەندی ئەوین بە کۆت و زنجیر
مامزێکی مەم ـ ی دەکردە نێچیر

ئەو ڕۆژە کە کاکی دەرچوو بۆ ڕاو
شۆڤار و نەیار بڕان لە بەر چاو

نێرینە نەما لە باخ و ماڵا
خەرمانی خەیاڵ لە دەوری هاڵا

تا هەل هەیە هەستە، ئەم جیهانە
چەپگەردە نە سازە بێوچانە

تا دەرفەتە سەیری گوڵ کە، ئەی دڵ!
ترسم هەیە زوو بچیتە بن گڵ

گەشتێکی بکە لە دەم دەراوێ
تاوێ لە مەلان بگێڕە چاوێ

بیستوومە هەیە یەکێ بەخت ڕەش
وەک ئێمە لە ئاخ و داخە و بێبەش

ڕۆژ ناڵە دەکات و داد وهاوار
بە خوێنی دڵی دەژی بە شەوگار

بێچارە لە دەوری گوڵ دەدا خول
ئاوارە مەلێکە ناوی بولبول

دەرمانی دڵی منی لە لایە
ببینم و لێی بکەم تکایە

وا خوایە دەڵێم بە گفت و پەندێ
ڕێم پێ بڵێ دەرکەوم لە بەندێ

خۆی دزییەوە کەوتە باخ و گوڵزار
بێتایەن و سەرسپی و پەرستار

کەم سەیری گوڵان دەهاتە بیری
زۆرتر دڵی دەچووە گۆشەگیری

باخ بۆیەیە چۆڵ و دوورە خەڵکە
بۆ گریە و داد و شین بەکەڵکە

باڵای وەکوو سەروی خستە سەر گڵ
فرمێسکی ڕژاندە بن گوڵ و چڵ

مێلاقە* لە تاوی پەڕپەڕی کرد
خونچە لە گەڵی بەرۆکدڕی کرد
*مێلاقی = گوڵێکە ، گوڵی لالە.

هەر دارێ وەکی وی لەش بەبار بێ
پشکۆ بوو هەموو گوڵی هەنارێ

لایان کە دەسی دەکرد بە باسان
خۆیان دەهەژاند لە گەڵ هەناسان

لە سوێی وی لەسەر لک و لە هەر پەل
گاڵەی بوو گەڵا بە ناڵە بۆ مەل

فرمێسکی ئەوەندە ڕشت لە چاوان
ئاڵ و گەش و سوور بوو ڕەنگی ئاوان

سیس بوو گوڵ و شینکە کەوتە ناو هەش
ئاهی لە هەوا بووە پەڵە و کەش

بولبول خەمی خۆی لە بیر نەمابوو
بۆ ئەو لە پەژارە و خەما بوو

زۆر چاوی گەڕاند لە دۆست و هاودەرد
دابیەستە وتار لە گەڵ گوڵی زەرد

تۆش وەک منی ڕەنگ لە ڕوو پەڕیوی
تۆش ئاخۆ ئەوین دڵی بڕیوی ؟

تێراوی، هەزارپەڕی، تەیاری
ئەی چیتە کە زەرد و کز دیاری

تۆش دڵ بە کوڵ و خەمی وەکی من
تۆش دیارە کە بێ مەم ـ ی وەکی من

بولبول لە گوڵی گوڵاوە کڕیار
تۆش وەک منی دوور لە دڵبەر و یار

پێم خۆشە کە ببیە هەمدەمی خۆم
دردی مە یەکە و منیش وەکی تۆم

خوشکێکی منیش وەکوو گوڵی سوور
دڵداری گەیشت و ما لەمن دوور

من ماوم و بولبولێکی داماو
بۆ یەکدی جگەربڕاو و سووتاو

بێچارەم وچارەڕەش وەکوو ئەو
ڕەنگ زەردم و ڕۆژ و بەختمان شەو

هەر جارێ کە بمدیایە تەنیا
بڕیارە گلەم نەبێ لە دنیا

****

## مەم ـ یش بەرەو باخی میر دەچێت

چی دێتە سەرت لە ڕاست ئەگەر چەوت
هۆیەک هەیە دێتە ڕێ ، بە هەڵکەوت

دوو یار هەیە دڵسووتاوە بۆ یەک
لەپڕێکی بۆیان دەڕەخسێ هۆیەک

ڕێکەوتێ دەبێ و دەگەن بە دڵخواز
نیازیان چییە تووشی دێن لە ڕێباز

مەم هێندە لەشی گرانی ئازار
ڕۆژێ کە نەمابوو کەس لەناو شار

کەوتو سەری بیری دینی زین ـ ێ
بیماری نەهێشت گڕەی ئەوینێ

هەستی نەدەکرد بە لەش بە باری
چاک بوو بە هەوای دیداری یاری

شێواویی کەوتە ناو دەروونی
دەرچوو بوو لە دەستی دەرنەچوونی

ئاواتی دڵی دەچوو لە پێشا
وەک خدری نەمر دەسی دەکێشا

سەرکێش بوو دڵی پساندی هەوسار
هێدی نەبوو تا گەیشتە گوڵزار

زین ـ ێک کە بە ڕۆژ و شەو دەم و ژەم
گیرابووە ناو تەمی خەمی مەم

دەیویست هەر ئەوەند بژی بە ژینێ
جارێک بە تەنێ مەم ـ ی ببینێ

ڕوانی لە نەکاو مەمۆ لە دەرهات
وا داری هۆمێدی بۆ وەبەر هات

عیسا گەیی بۆ نەخۆشی حەستەم
بوورایەوە دڵ گرێدراو بە یەک دەم

تاساو تلی دا دڵی و سەری خول
پێسیری* دڕی لە تاوی بولبول
*پێسیر = بەرۆک ، یەخە.

بێ هێز وتوان کەوت بە بێ هۆش
سەرچیمەنی کرد بە بەژنی گوڵپۆش

مەم هات و لە گوڵ خشاندی چاوێ
وێستا لە پەنای وەنەوشە تاوێ

ئەی گوڵ وتی: گەرچی نازەنینی
کوا وەک پەڕی کوڵمی سووری زین ـ ی

لاوچاکی هەچەند ونەوشی پەڕگەش
ڕێت ناکەوێ بچیە پاڵ کەزێی ڕەش

هۆ! بولبول ئەگەرچی دردەداری
سووتاوی گڕی گوڵی بەهاری

تاقە گوڵەکەم لە گوڵتە گەشتر
خۆشم لە تۆ بەخت و چارە ڕەشتر

دڵداری بە ڕاستی، هەر منم من
بێهوودە ژیانی خۆت دەکەی ون

گوڵ هەر نە یەکێکن، سەد هەزاران
دەڕوێن لە زەوی هەموو بەهاران

هەر دلبەرێ چەشن و جۆری زۆرە
بێ نرخە هەچێکی زۆرە :بۆرە

هەر جێیە دەچی گوڵ و گوڵووکە
هەرجاییە گوڵ گەڕۆکە سووکە

ئەو سوورە گوڵەی کە من بژاردم
دامێ دڵ، ئەوینی پێ سپاردم

وێنەی لە جیهان نییە یەکی تر
نایێ زەوی چەشنی زین ـ ێ چی تر

دڵداری گوڵێکی وا کە نەمرێ
چ بکا و بە چبارێ چاری دەکرێ؟

سەرگێژ دەگەڕا بە دەم گرینێ
لەپڕێکی گەیشتە بەژنی زین ـ ێ

ئەو زین ـ ە کە بووی دوو سەت پەرستار
ئەو بەژنی لە پەلکی گوڵ بە ئازار

خوێ داوەتە سەر گیاوە، بێهۆش
تۆمەز لە مەیی ئەوینە سەرخۆش

ئەو گەوهەری بێ هەواڵە لەو شوێن
بەرچاوی کەوت مەم ـ ی جگەرخوێن

لەرزی وەکوو ئاو، چوو لەسەر هۆش
پێڵوی چەمی بوون لە زین ـ ێ پاپۆش

فرمێسکی پەڕینە لاقی زین ـ ێ
دارگوڵ وەگەشا بە ئاوی ژینێ

ئاونگی تکاند و خونچە پشکووت
زین ژیایەوە مەم بە تیری ئەنگووت

بڕوای نەبوو چاوی مەستی زین ـ ێ
پێی وابوو مەم ـ ی بە خەو دەبینێ

هەر تاکوو مژی گومانی لاچێ
ویستی دەمی تەڕ بکا بە ماچێ

خۆی هێشتە گەلێک نزیک نەکردوو
بۆی ژیاوە نێچیری نیوە مردوو

چۆن ژینێ گەیشتە مەم کە هەستا
زین ـ ی لە تەنیشت و دەست لە دەستا

لە خۆشییەوە هەر دوو گێژ و وڕ مان
بێ ورتە و لاڵ و پاڵ و کڕ مان

داخواز بە دڵە و بەڵێن بە چاوە
تا کاتێ گرێی زمان کراوە

ئەم جارە بە گازنان* و نازان
بەربوونە گلە و نیاز و ڕازان
*گازن = گازندە ، گلەیی.

دیتیان گلەیی لە دەردی دووری
بێ بەهرە بوو، کاتی پێ دەبووری

با دەستێ دە بەژنی یەک وەرێنن
ڕیشەی کوڵ و کۆ لە ڕەگ دەرێنن

دووی تازە نەمام لە یەکدی هاڵان
تاڵانە مژینی لێو و خاڵان

نۆشیان مەیی دڵتەڕی لە لێوان
نە ژمارە هەبوو لەوێ نە پێوان

کوڵم و چەن و لێو و سنگ و گەردن
هەر یەک دەم و دەستی بۆ دەبردن

سەر بوونە گران لە وردە ماچان
هەر دەرد و کەسەر بوو دا دەپاچان

زین ببووە گڕ ڕاگرێکی حەستەم
پڕ تێن و دە ئاییسا لە بەر مەم

مەم ببووە پەپوولەیەک، مەرگ گڕ
پەروانە بوو خۆی دەخستە سەر گڕ

بیگوێزنەوە، ئاشکرایە جێ و شوێن
زۆر خۆشە تلاندنەوەی لەسەر نوێن

لەو باخە هەبوو چ سەرسەرایەک
ئاوێنەیی جەم ، جیهان نومایەک

مەم پیادە و زین لە باوەشی مەم
وا دەستەملان و دەم لەناو دەم

سەرکەوتن و گەیشنە شانشینان
هەڵچۆی گڕی دڵ لە دڵ بەتینان

زین! وا دەمی مەم ، دە بمژە لێوان!
مەم ! وا مەمی زین، دە بوگشە سێوان!

با چاو بە بەفر کەوێ لە سەر سنگ
با پڕ ببێ قوڵکی مل بە ئاونگ

خوێی گەردنی یەکتری بنۆشن
مەست ببن و لە شەرمێ چاو بپۆشن

تۆڵەی دەمی دووری سێندراوە
هەر نوێژێ کە ڕۆیبوو، گەڕاوە

ئەو نوێژە کە ماچ دەچێتە جێگەی
هەڵدەگرێ سەرت بچێ لە ڕێگەی

ئازاد ببوو لەش ، لەپێ هەتا سەر
بێجگە لە نێوانی نێوک و کەمبەر

پاوان بوو نێوانی ڕانی هەر دوو
پاسداری لە پاکژی لەسەر بوو

دڵداری بە ڕاست و پاک و خاوێن
چاوی تەڕ و سوور دەبێ، نە داوێن

ژەنگ ناگرێ هەرچی زێڕی چاکە
پیس نابێ کەسێ بنیچە پاکە

جوانیی و بەهار و باغ و دڵبەند
یەک بۆ یەکێ هێندە ئارەزوومەند

نەخوازە ئەوین وەها ببێ زاڵ
ڕۆژێک هەلێ هەڵکەوێ بە چەند ساڵ

چۆن پەسنی بدەم دەبێ چ بێژم
تێماوم و کاس و گێژ و وێژم

****

## میر و ڕاوکەران بەسەریاندا دێن

مەیگێڕ نەچی دەست لە ئێمە بەردەی
سەرخۆشم و مەست، بەڵان بە بێ مەی

مەستی کە گەیشتە نازەنینان
ورتاندی لە من دەمی برینان

هەر چەند بە ڕواڵە مەی پەرەستین
ڕاستی بە مەیی ئەوینێ مەستین

سەوداگەر و مەستی دەستی تۆ نین
مەستی مەیەکی لەمێژ و کۆنین

ئەو مەی نە بە ڕەنگ و بۆ دیارە
ئەو مەی لە جووانی کردگارە

دڵمان بە خوداوە بەستراوە
هێشووی مە لەباخی ئەو چناوە

مەیگێڕ دەوەرە لە ڕێی خودا دا
بۆم تێکە، پەژارە دەین بە با دا

لەو بادە کە دەت گەڕاند دوێنێ
سەرخۆشی هەتا هەتا دەمێنێ

بێهۆشی تێدا سەرەونخوونە
بە پزیشکی دەروون هەمیشە ڕوونە

هەر تاقە قومێکی لێ بچێژم
یەکجاری خەم وخەیاڵ بنێژم

لادەم لەسەرم سەرێشی دوێشەو
وشیار بمەوە لە گێژیی و خەو

هۆشم لە دەسم نەچێ وەکوو مەم
مەرگم بە سەرا نەیە وەکوو هەم

ڕۆژی تەمەنم گەیشتە ئێوار
ئاگام نەبڕی لە خۆم بە یەکجار

هیوای دڵی ژار و هەرزەکارم
جێگایە هەبێ کە لێی وەشارم

ئێوارە کە میر لە ڕاو گەڕاوە
لەو باخە بە لەشکر و سوپاوە

فەرمووی بە هەواڵی دیوەخانێ
با دابەزین و بدەین وچانێ

لێدە کەڕەنا و دەهۆڵ و شەیپوور
ئاهەنگ بگەڕێ بە ساز و سەمتوور

بەریان دەنە مێشە، ئاسک و (گۆڕ)ان
بریان ببێ بۆ مە سینگی(پۆڕ)ان

هاوپیاڵە و بادەگێڕ نەکەن ڕەو
بازمی مە لە کۆشکی باخە ئەم شەو

دیتیان دەر و پەنجەرەی لەسەر پشت
پرسیارێ دەهاتە سەر دەمی گشت

کێیە لە سەر و ژیان بووە زویر
پێی ناوەتە کۆشک و سەرسەرای میر

ئەو دڵتەڕ و دڵسووتاوی یەکتر
گیرۆدەیی بەند و داوی یەکتر

لەو بگرە و بەردە لەو هەرایە
لەو زرم و کوت و زەنازەنایە

وشیار نەببوون ، پێیان نەزانی
گوێ بیست نییە مەستی کامەرانی

میر ڕاستەوەخۆ کەوتە شانشینێ
جێ ژوانی مەم ـ ی هەژار و زین ـ ێ

گوڕاندی کە کێ لە ژین بووە تێر
وێراویەتی پێ بنێتە جێی شێر ؟

تاریک بوو نەکاری کەس ببینێ
کووژایەوە تیشکی کوڵمی زین ـ ێ

مەم چوە لە نوێنێ پاڵی داوە
زین ـ یشی وەشارت لە ژێر عەباوە

بە چرا دەر و ژوور کە ڕوون کراوە
بە کزێکەوە مەم وەرامی داوە:

بمبەخشە نەخۆش و بێ بڕەستم
هیچ هێزی ئەوەم نییە کە هەستم

گەورەم تۆ دەزانی چەند نەخۆش بووم
تا دوێنێ بە دوور لە بیر و هۆش بووم

ئەمڕۆ کە ئەتۆ دەچوویتە ڕاوێ
من خۆم نەدەگرت لە جێگە تاوێ

مەم شۆڕە سواری پێشڕەوی میر
بێبەش بێ لە گەشت و ڕاوی نێچیر؟!

سووتا جگەرم نەما سرەوتم
پەتیارە و شێت وەچۆڵێ کەوتم

شل بوو لەپڕێکی هێزی ئەژنۆم
خۆم دیتەوە وا لە باخەکەی تۆم

بێ ئەرکە نەخۆش، وتی بە مەم ، میر
تووشت نەبوو هیچ بە تووشی نێچیر ؟!

میرم ! وتی: تووشی مامزێک بووم
چۆن مامزێ ؟ تووشی دڵ دزێک بووم

سەرمێگەلی پۆلی چاوکەژاڵان
ڕەوتی دڵ و هۆش دەبا بە تاڵان

بۆی خۆشی دەدا بە ئاسکی چینێ
چم دی! وەکوو من چ کەس نەبینێ

دەیڕوانی هەچەند بە نیوە ئاوڕ
جەرگم دەتووا، دڵم دەبوو سڕ

پێم وابوو فریشتە بوو نە ئاسک
لە کوێ هەیە ئاسکی هێندە ناسک!

پێش پێی تۆ لەناو هەمێزی من بوو
تۆ هاتیی و ئەو فریشتە ون بوو

تاژدین لە وڕێنەکانی زانی
زین گەیوەتە ئێرە بۆ ژووانی

مەم شێتە، وتی: هەڵەی بپۆشە
نازانێ دەڵێ چی، زۆر نەخۆشە

با لەو بگەڕێین ببێتە ئاهەنگ
با مەی بگەڕێت و دەنگ بدا چەنگ

با تاوێ بە بادە سەر گەرم کەین
بۆ دەردی ئەوینێ دڵ نەرم کەین

****

## برای باش بۆ ڕۆژی تەنگانە باشە

ئەو جۆش و خرۆش و بەزم و ئاهەنگ
زۆرتر مەم ـ ی کرد زەبوون و دڵتەنگ

تاژدین دی کە مەم گەلێ کەساسە
لێی پرسی بە چاو، برا چ باسە ؟

مەم دەستی لە ژێر شمەک دەرانی
بسکی ڕەشی زین ـ ی دا نیشانی

پاپۆکەیەتی لە پشت مەم ـ ی ژار
جووتێ کەزی ڕەش وەکوو دوو شامار

دی کارەکە گەند و نالەبارە
بۆ ڕۆژی وەها برا بە کارە

هەر لاق و دەسێکی بوو بە باڵێ
هەرچی زووە خوی گەیاندە ماڵێ

ئەستی گوتی: ڕەنگ لە ڕوو نەماوی
کێت دوژمنە، چیتە داشڵەژاوی ؟!

تاژدین وتی: ماڵە دوژمنی من
کۆتێکە لە پیل و گەردنی من

سەرمایەیی گەورە و گرانم
بیبیلەیی هەر دوو چاوەکانم

مەم بوو ، ئەو و زین لە گێژی کەوتوون
سامانی مە، گەر نەچێ، ئەوان چوون

گەر ئاگرێ بەر نەدەینە خانوو
بۆ چاری ئەوان نەمانە بیانوو

ماڵ بۆ من و بۆ تۆ، کۆرپە ساوات
ئەم پیاوەتییەم دەویست بە ئاوات

بیستوومە کەسانی خانە سووتاو
ئاگر دەکوژێننەوە بە هۆی ئاو

من ئاوی بەڵادەری براگر
ئەم شەو دەکوژێنمە بە ئاگر

ماڵ ئاگری گرت لەسەر هەتا خوار
تاژدین ملی نا لە داد و هاوار

خزم و کەس و کار و هۆز و هاواڵ
یەکجێ هەموو بازی دا بەرەو ماڵ

هەرکەس کە لە باخ و سەرسەرا بوون
تاقێکی نەما بەرەو هەرا چوون

مەم موژدە دەدا بە زین، کە تاژدین
بڕوانە کە چی لە بارە کردین ؟

دەریای خەمی لێ وشک هەڵێناین
بە گڕێکی لە دۆژەهی دەرێناین

تۆ هەستە بچۆرە کۆشکی شایی
من تووڕ بدە ئاگری جودایی

تاژدین هەچی بووی هەمووی سەر و بەر
لە شمەک، لە خشڵ، لە زێڕ و زەمبەر

له پیاوەتییا کە گشتی دانا
ما ناوی نەمر لە ڕووی جیهانا

لە دڵی خۆ دراو، دەراوێ کاکە!
کارت کە هەیە بە ناوی چاکە

قالۆچە وەکوو دەکەن شیاکە
گەر پاکی، نەپاک لە خۆت جیا کە

بەختێ کە دراو ببەخشێ بێ خۆ
دەیبەن کەلەپوور گران، بە فیڕۆ

ئەو کاتە گیان دەچێتە باڵا
نە دراو، نە شمەک بە دەستی واڵا

بازاڕی ئەوێش وەک ئێرە وایە
هیچت نەبێ چت لە دەستی نایە

کەی نرخی بەهەشتە دوو وتەی ڕووت
کەی ڕێ هەیە بچتە پێشێ نابووت

خۆشیت گەرەکە لە ڕۆژی داوایی
پێش بارێ بەڕێکە تاکوو ماوی

یان بەختی بکە* لە ڕێی هەواڵان
پاش مردنی خۆت دەچی بە تاڵان
*بەخت کردن = دۆڕاندن، بە هەوادان، زایەکردن.

تاژدین ـ ی* چ خۆشە هەڵکەوێ بۆت
ناوێکی نەمر بسێنی بۆ خۆت
*تاژدینی = هەر وەک تاژدین، لەگوێن تاژدین، لەچەشنی تاژدین .

دەستت کەوێ دۆستی ڕاستەقینە
هێزای هەموو گەنجی سەرزەمینە

****

## ڕازی دڵداریی زین و مەم ، بە میر دەگاتەوە

شای پایەبڵندی خۆشەویستی
خونکاری جیهانی دڵپەرستی

ئەو سەروەرەی خێوی تەخت و بەختە
ون بوونی لە چاو شتێکی سەختە

وەک ڕۆژ کە لە عاسمانی چوارەم
لەم جێگە و ڕێگە دوورە هەر دەم

بێ بەرگر و پەردە تیشکی داوێ
کام چاوە نەبینێ تیشکی تاوێ

دڵداری و خۆر وەکوو برانە
شێرانەوەیان* گەلێ گرانە
*شێرانەوە = حەشاردان، شاردنەوە .

تیژباڵ دەفڕن نێوانێ دەبڕن
لەمپەر دەپەڕێنن و پەردە دەدڕن

ڕازی دڵی زین نهێنیی مەم
هەر هێندە ژیا کە هاتە سەردەم

بلوێری شڕی زمانی ناساز
ئاوازێ دەدا لە چۆل و ڕێباز

لەو جووتە وەها بڵاو ببوو دەنگ
ببوە گەڕی کۆڕی بەزم و ئاهەنگ

لەو مۆم و پەپوولە بێ برەو بوون
بەر هەر وت و وێرەیەک* هەر ئەو بوون
*بەر هەر وت و ویرەیەک = بەر لە هەر قسە و باسیکدا...

وەک شەوچەرە بوو لە دیوەخانان
دڵخۆشکەرە بوو لە نێو جوانان

دووی دوور لە هەموو گوناه و سووچێک
ناویان چووە هەر کەلێن و سووچێک

هەر زاریٚ وەکوو بنێشتە خۆشە
دەیجوو لە هەموو کەنار و گۆشە

هەر ڕازیٚ کە جاریٚ کەوتە زاریٚ
وا بزانە کە کەوتە زاری شاریٚ

وشتر نە بەسی بوو بار گرانی
وا زەنگوڵەشی خرا ملانی

بێکار و زمان شڕ و نەزانان
منداڵ و ژنان لە دەرک و بانان

گفتیان گڕ و وڕ کە زۆر و کەم بوو
دڵ پێکەوە بوونی زین و مەم بوو

ببووە سەر وبن لە بەند و بەیتان
تا تەنییەوە گەییە (بەکرە شەیتان)

دەستەوبەجیٚ ڕیٚ و ڕیٚ نەبوو گیر
نووک و بەدی نایە بەر دەمی میر

میر پرسی کە چۆن دەزانی وایە؟
بۆم دەربخە لەم گڵۆڵە تایە

بۆم ڕوون کەوە بیخەرە بناوان
چۆنی بگرین بە سووچ و تاوان

هاسانە، وتی بنێرە مەم بێ
تاق ببنەوە خۆت و ئەو لە یەکجێ

شەترەنجێ بکەن لە مەرجی دڵخواز
لێم ڕوونە کە دێنە ڕوو، ونی* و ڕاز
*ونی = شاراوە، نهێنی .

دۆڕاندت و برتەوە، لە جێوە
لێی پرسە بڵێ دڵت بە کێوە

ئازایە، نەترسە، پاڵەوانە
سینە و دڵی پاکژ و جوانە

دڵدارەکی ڕاست و بێ درۆیە
دەیڵێ کە دڵی لە خوشکی تۆیە

خۆت ئەو دەمە خێوی بیر و ژیری
خاوەن دەسەڵات و بەند و شیری

خونکار وەکوو ماری ژەهرەدارن
جوان دیاری دەدەن لەبن نەیارن

ماچت کە دەکەن، بترسە ژەهرە
زیانیان پترە لە سوود و بەهرە

خۆت توخونی مار نەکەی کەم و زۆر
مار، مارە ، چ زەر، چ ڕەش سپی و بۆر

هەرچەندە لە لای بە نرخ و نازی
پێک بێنی هەچێکی لێی بخوازی

تۆزێک لە گەڵت دڵی کە گۆڕا
جێت چا دەکرێ لە تەنگی گۆڕا

نەخوازە کە پیس و دوو زمانیش
لای بن، چ دەکەی لە چنگ ئەمانیش

ئەی خوایە نەکەی نزیکی سەردار
نە پیاوی هەژار و پاک، نە بەدکار

****

## مەم دەگەڵ میر شەترەنج یاری دەکا

شاسواری بناری خاوەرستان
خوای بەرز و بڵندی ڕۆژپەرستان

ڕۆشنکەرەوەی بەژ* و کەژ و کۆ
کاتێ کە وەسەر کەوت لە ئاسۆ
*بەژ = وشکانی ، خاکی .

تیرێژی* کە ڕشت و دابەشی کرد
دەوری شەوەزەنگی دا و کشی کرد
*تیرێژ = تیشک ، شۆق.

مانگ بەو کشە، ماتە* و کۆی ستێران
وەک پیادە لە گۆڕێ هەڵوەژێران
*کش و مات = لە ئەنجامی یاریی شەترەنج دا بۆ لایەنێک دێتە پێش.

میر ئەو شەوە چەشنی شێری زامار
هەر جینگڵ و پێچی دا وەکوو مار

شەوگاری گەیاندە ڕۆژ بە بێ خەو
خەم کەوتە دڵێکی، خەو دەکا ڕەو

شای تاوێ کە هاتە سەرزەمینێ
شای ئێمە گەیشتە شانشینێ

فەرمووی ئەوی نۆکەری بەکارن
هەرچی لە چەک و شمەک تەیارن

کێ دەسکەرەوەن هەڵی بژێرن
دەورەم دەن و پاسی من بدێرن

ئەمڕۆ دەمەوێ بەسەر (مەمـ)ـا بێم
با بزانێ کە ئەو چییە و ئەمن کێم

بۆم بانگ کەن و نابێ پێ بزانن
تاژدین و ئەوانی سەر بە وانن

مەم دی لە تەلاری میری دوو ڕەنگ
ڕازایەوە کۆڕی بەزم و ئاهەنگ

هەرجێ پڕی خۆش و بۆنی خۆشە
مەیگێڕ دەڵێ خۆش بە، مەی بنۆشە

پاش تاوێ بە مەی کە سەرگەرم بوون
شەرمن کە بە بادە بێ شەرم بوون

هیچ دوانێ نەما لە دێو و لە درنج
کێشای وتە، تا گەیشتە شەترنج

ڕووی کردە مەم ـ ێ ئەگەر بخوازی
ویستم لە گەڵم بکەویە بازی

ئامرازی لەیستنت* لە پێشە
کێشەی من و تۆیە دەست بکێشە
*لەیزین = لەیستن = یاری کردن، قومار کردن ، نمایش کردن

کێ بردییەوە مەرجی ئێمە وابێ
هەرچی دەیەوێ دەبێ ڕەوا بێ

لاوێکی لەلا بوو میر، چ لاوێک
ئازا و بەکار و خێوی ناوێک

ڕۆستەم دەسی بەسترابوو لە لای ئەو
بۆ جوانی نەبوو یەکێکی تای ئەو

سەرتۆپی کوڕان و ناوی گورگین
مەرد و بە ئەمەک گران و سەنگین

هاوبازیی و هاودەمی مەم ـ ێ بوو
هاوشادیی و هاوخەمی مەم ـ ێ بوو

زانی چییە، خۆی گەیاندە تاژدین
تاژدین ـ ی وەکوو پڵنگی بە برین

ئاگایی بە عارف و چەکۆ دا
هەر شێرە چەکی هەرای لە خۆ دا

ڕازاوە کەمەر بە خەنجەر و شیر
دڵگیری برا گەهانە کن میر

لەم هاتنە مەم دووبارە بوو گەش
مۆرەی لە دووبارە بوونە دوو شەش

ئەسپ و ڕوخ و فیل لە دەرکە هاتن
دیان میر و وەزیر و (شا)شی ماتن

مەم دیارە لە وازی کاری سازە
میر بۆیە دەڵێ دوو دەستی تازە

ئەم دەستەشی بردەوە دەمەوجار
دیتی لە ڕوانگە (بەکر)ی شۆڤار

وا (زین)ە لە پەنجەرە دیارە
چاو و دڵی چاوەنۆڕی یارە

ڕۆژێکە لە مانگ دەگیرێ چاوی
بڕوانە چ داوێ کەوتە داوی

کایە، وتی: میری من بە جێیە
نابەیتەوە تاکوو مەم لەوێیە

با جێگەیی خۆی بە تۆ وەگۆڕێ
لێم ڕوونە دە دەستی مەم دە دۆڕێ

میر گۆڕیەوە جێ بەجێی مەم ـ ی ژار
جێگەی مەم ـ ی کەوتە ڕوو بەڕووی یار

هەر چاوی مەم ـ ێ کەوت بە ڕووی زین
گورجێ لە دەسی چوو فیل و فەرزین

چاوبڕکێ بە جۆرێ هۆشی گۆڕاند
ئەسپی بە پییادەیەک دەدۆڕاند

لەو دیمەنە مەم وەها ببوو مەست
هۆشی نەبوو دای لە دەستی شەش دەست

ها مەم ! وتی میر: دەبێنە دڵخوام
فەرموو چ دەڵێی، وتی: لە ڕێدام

فەرمووی نە شتێکی وایە دڵخواز
ویستم لە گەڵت ببم بە هاوڕاز

ڕازی دڵی خۆت کە ئاشکرا کەی
لای ئێمە گرێی دڵت ڕەها کەی

کێت دڵبەرە، کێ دڵت لە سەریە
هەرکێ بێ، فریشتە یانە پەریە

هەر ناوی بهێنی بۆتی دێنم
گەر خواهیش و زۆرە، بۆت دەسێنم

هەل هاتوو دیتی بەکر ـ ی بەفەڕ
قەل هاتە قڕین و هاتە سەر گەڕ

هەرکەس وتی، یاری مەم بناسێ
واقی وڕ ئەبێ و سەری دەماسێ

زۆر بۆ مەم ـ ی چارەڕەش کەساسم
لەو ڕۆژەوە دیومە هێڕ و کاسم

بێچوە قەرەجێکی لێو کوتاوە *
کرمە و لە قورم دروست کراوە
*لێوکوتاو = مەبەست وردەخالی شینی کوتراوی دەروی لێوی کچە کۆچەرییەکانە .

بەژنی وەکوو داری ژەقنەبووتە
وەک سەلکە بزووتە، ڕووتە پووتە

ڕێی ناکەوێ تۆی ببی بە داخواز
تووشم دێ هەزاری وا لە ڕێباز

ئەو تەوسە شتێکی وای لە مەم کرد
تاس و وڕی کرد، لە هۆشی دەر برد

گەورەم! وتی: ڕاست نییە و درۆیە
هەڵبەستەیە ، گفتی سەربەخۆیە

ئەو شۆخە کە بوومە تۆزی ڕێگەی
شازادەیە ، شانشینە جێگەی

هێلانە بڵیندە توخمی پاکە
ڕووناکییە، نەک لە ئاو و خاکە

بێ هەمبەر و وێنە ، نازەنینە
شانازی زەمینە، ناوی (زینـ)ـە

ئەو گووتنی نالەبار و ناخۆش
کینە و ڕقی میری خستە سەرجۆش

گوڕاندی لە پۆلی دەست و پێوەند
بۆ نایخەنە بەند و بیکەنە پەند

خوێخۆر کە ئەشکەنێ* نمەکدان
زیندانی دەوێ لە تەک شەتەکدان
*ئەشکەنێ = دەشکێنێ.

دوو سەد کوڕە پاڵەوانی حەستەم
یەکجارە هورووژمی کردە سەر مەم

تاژدین و چەکۆ و برای لە دوو بەر
هەستان وەکوو شێر و دەس بە خەنجەر

وتیان گەلی نۆکەران بوەستن
چۆن ئێوە دەسی مەم ـ ێ دەبەستن

بڕواننە مە خۆ نە گێژ و کاسن
خۆو* هێز و گوڕی مە باش دەناسن
*خۆو = ئێوە خۆتان، ئێوە بۆخۆتان.

هەریەک لە مە بێ و لە ئێوە پێنسەت
دەوکەین* بە دەمی دەبان لەت و پەت
*دەوکەین = دەتان کەین.

تا ماوە تنۆکێ خوێن لە نێو ڕەگ
یاریدەدەری دەبین و کۆمەک

هەرکەس لەوە* چەپ لە مەم بنۆڕێ
گوڕ گۆڕیەتیی و ڕێ لە خۆ نەگۆڕێ
*لەوە = لە ئێوە ، هەرکام لە ئێوە.

میر سەروەری گشتە، خێوی فەرمان
گفتی وی لە بانی چاو و سەرمان

خۆی هەرچی لە مەم بکا ڕەوایە
گیان و سەری مەش لە دەس ئەوایە

دەس بەستە و بێ دەسین لەبەر میر
وا گەردن و پیل و پێ و زنجیر

میر بەستی بە دەستی خۆی دەسی مەم
تاژدین بەری چاوی گرت تەمی خەم

چاری چییە میرە خاوەنی کار
نانخۆریەتی چۆنی بێت بەرەنگار؟

خونکار مەمـ ی دایە دەستی دژدار
زیندان بووە جێگە بۆ مەم ـ ی ژار

ئەو شارە هەمووی، جوان هەتا پیر
بۆ گرتنی مەم ، پەشێو و دڵگیر

لەو ڕۆژە لە هەر کەس و لە هەر کوێ
هەر تووک و نزا دەهاتە بەر گوێ

****

## مەم لە گرتووخانە دا

بڕوانە لە ڕووی گەڕانی گەردوون
جارێک بزەیە و دەجار گرژ بوون

هەرچی کە بڕێک برەو پەیا کات
گورجێ دەیەوێ دە خاکی ڕا کات

نزمە و، هەچی بەرزی سەرزەوی بێ
پێی خۆشە کە چەشنی وی نەوی بێ

نابینی کە ڕۆژێ سەرزەمینێ
هەر ڕۆژە دەخاتە خۆرنشینێ ؟

چەوتە، دزە، لارە، خوارە، دوو ڕوو
وا هاتووە، وا دەبێ، وەها چوو

نەخوازە نەیاری دڵتەڕانە
هەر ئێمە دەهاڕێ لەم گەڕانە

دڵمان دەگرێ بە داوی نازان
پێخوستی دەکا لەبەر بەرازان

پێشان بە هومێد و شاد و خۆشین
پاشان لە دەسی زووخاو دەنۆشین

مەم دەگرێ بە داوی بسکی زین ـ ێ
ڕۆیدێڵێ لە چاڵ و ژێر زەمینێ

ئەو چارەڕەشی کزی بەخت کەم
بێ دۆست و هەواڵ و یار و هاودەم

ئەو بولبولی وێڵی دەشت و چیمەن
زیندانی ڕەشی کرا نشیمەن

هاوڕازی کوڵ و کەسەر خەفەت بوو
زیندان نەبوو، گۆڕی تەنگەبەر بوو

تووشی ببوو دەردی گۆڕەشارێ
هەر تاوە هەزار چەلان نە جارێ

چاڵ لێی بوە چاڵی مانگی نەخشەو*
ئەو مانگە دووحەوتە بوو بە یەکشەو

*مانگی نەخشەو = مانگێکی دەسکرد بووە گۆیا کابرایەک بە ناوی (المقنع) سازی کردووە. المقنع لە سەردەمی خەلیفە مێهدی دا ژیاوە و داوای خودایەتی کردووە و بۆ چەسپاندن و سەپاندنی داواکەی ئەم مانگەی ساز کردووە کە لە نێوان سەمەرقەند و چۆمی جەیحون دا ئێواران لە چاڵاوێکەوە سەری دەرهێناوە.

بێ خواردن و خەو لە ڕەنج و ئێشا
بوە گۆشەنشین چلەی دەکێشا

دەروێش کە کرووژمە کا لە قوژبن
دۆستی نەبێ* هەر شتێک دەکا ون

*ئەگەر دۆست و هاودەمێکی نەبێ، هەموو شتێک لە بیر دەکا و تووشی فەرامۆشی دێت.

جارێک وەکوو خواپەرەستی بەنیاز
گاگا وەکی دڵتەڕان بە دڵخواز

هەر تاوە لەگەڵ کوڵێ گرینی
بەو وێنەوە ڕووی دەکردە زین ـ ی:

ئەی بەندی دڵ و چرای دەروونم
ئەی بەستە بە تۆ نەبوون و بوونم

مەزنیت بە ڕاست، بۆ گەدا بەفیزی
ناپرسی لە ئێمە چیتە زیزی!

لە دڵم دەدڕی کراسی ئارام
گیرۆدەیی تۆم و نایەیە لام

لەیلێ وەرە شێتی خۆت ببینە!
چاوی تەڕ و سوورە، ژینی شینە*
*ژینی شینە = ژینی پڕ ماتەم و بە شین و گریانە.

شیرین تری، شیرنێ کەمێک داد!
یادێک بە دڵت بگا لە فەرهاد

دنیا کە لەمن بووە بە زیندان
ئەمڕۆ بە تەنێ منم موسوڵمان

فەرمایشی خۆشەویستی خوایە
فەرموودەیی ئەو دیارە وایە

دنیا کە بەهەشتی گاورانە
زیندانی دڵی بە باوەڕانە

هەرچەندە دڵم گەلێک پەرۆشە
چونکە لە ڕێگەی تە* دایە خۆشە
*تە = تو ، ئەتۆ.
سوێندم بە دوو لێوی تەنگ و ئاڵت
بەو بسکی ڕەشت بە وردە خاڵت

سوێندم بە بەری بەیانی لاجانگ
بەو هەنیە کە شۆق دەدا بە ڕووی مانگ

سوێندم بە دوو چاوە مەستەکانت
سەد جارێ بە شیوی* ناو مەمانت
*نەرمانی نێو دۆڵ ، نەرمانی نێوانی دوو بەرزایی.

سوێند بەو بزەیەی کە دێتە لێوت
سوێندم بە دوو مەمکی شەکرە سێوت

سوێندم بە نەمامی بەژن و باڵا
سەد ساڵی تریش بژیم لە چاڵا

تا ماوە هەناسەیەک دەزانم
تۆ ناچییە دەرێ لە ناو گیانم

لەو بەندە کەوا شەتەک دراوم
پێت وانەبێ لێت هومێد بڕاوم

ڕۆشم کە بەرن بە ناخی گڵ دا
دەرناچێ هومێدی تۆم لە دڵ دا

هەرچەندە کە میر بەسەر منا هات
ئەم جارە بە لانی دوژمنا هات

بێ جێ نەبوو زۆر سپاس کەوا بوو
ئەو جل نە بە بەژنی من بڕابوو

شازادەیی و من گەدا و هەژارم
چۆن ڕێم دەکەوێ ببیتە یارم

تۆ ڕۆژی بەتیشک و من گڵی ڕەش
من چقڵ و دڕوو، ئەتۆ گوڵی گەش

تۆی تازە نەمامی باخی ژینێ
تۆی گەوهەری شەو چرای زەمینێ

مەم سیسە پەپوولەیەک لە پڕ دا
ویستی کە بسووتێ خۆی لە گڕ دا

تۆ مانگی گەشی و لە بێ بەشی من
دادەڕزێ بە تیشکی تۆ لەشی من

من لولوپەڕ* و، ئەتۆی هەتاوم
لێت دوورم و نوقمی ئاوی چاوم
*لولوپەڕ = نیلوفەڕ، لاولاو، ناوی گوڵێکە بە دار هەڵدەچێ و ئاشقی هەتاوە.

با یادی گوڵم دڵم دەرێنێ
دڵداری هەژار ئەوەندە دێنێ

با بڕزێ لەشم لە گرتووخانە
ئەسرین لە گلێنە ببنە تانە

دەروێشم و ئەشکەوت نشینم
دڵخۆشی ئەوینی ڕوویی زین - م

مەم بەر لەوە بمرێ مردنی دیی
ئەم مردنە ژینە ! مردنی چی ؟

پا ببوەوە* کەوتە ڕیزی چاکان
دەرچوو بوو لە چینی ئاو و خاکان
*پا ببوەوە = خاوێن ببوەوە ، بێ گوناه بوەوە.

تیشکێکی گەیشتە ناو دەروونی
ڕوونی دڵی ببووە ڕێنموونی

هێشتا چلەیەک نەبووبوە تێپەڕ
سەرپاکی گومانی بوونە باوەڕ

سوور بوونەوە بۆی شتی نهێنی
ڕاستی وەڕێ هات و کەوتە شوێنی

هاویشتی لە دڵ ئەوینی تێکوڵ
گوڵ هاتە بەری لە باتی تێکوڵ

گیان باویەتی چی لە لاشی پووچەڵ
گەپچاڕی مناڵە داری کۆتەڵ

گوڵگەشت و بەهەشت و دەشت و چیمەن
لەو چاڵەوە لێی ببوو بە دیمەن

دار و دەوەن و چڵ و چیا و کەژ
بێ گیان و ژیاو لە ئاو، لەسەر بەژ*
*لەسەر بەژ = لەسەر وشکانی ، لەسەر زەوی.

هەرچی کە بەدڵ لەوی دەنۆڕی
هەرچێکی بە بیریا دەبووری

زین ـ ێکی دەهاتە پێشی چاوان
دڵداری بەڕاستی ڕاستە، ئا، وان

ئەستێرەگەری دەکرد لە چاڵا
چارەی ڕەشی خۆی دەدی لە خاڵا

****

## زین لە چارەڕەشیی خۆی دەدوێت

ئەو زین ـ ی بە داوی دڵ گرفتار
ئارامی لە لا نەما بە یەکجار

تا مەم نەخرایە گرتووخانێ
هیوای نەبڕا لە پێک بڕانێ

لەو کاتەوە یاری کۆت لەپێ دی
دەورەی دڵی دابوو ناهومێدی

سەیرانگە و شانشینی دڵگیر
بۆ ئەو بووە بەند و کۆت و زنجیر

دوژمن بوو لە خواردن و لە خەوتن
ئارای نە بە ڕۆژ، نە بە شەو سرەوتن

بێ هێز و توان و دەستەوئەژنۆ
هەر (مەم ـ مەم)ی بوو بە داد و ڕۆ ڕۆ

دەتوایەوە بۆی دڵی ڕەقی بەرد
لاواز ببوو، ببوە موویەکی زەرد

زەردێک وەکوو ڕەنگ و ڕوویی خانی
باریک ببوو لە چەشنی بیرەکانی

گەر لێی نە دەبۆوە هیچ دەرووی ڕوون
هاواری دەکردە چەرخی گەردوون

چم کردووە بۆچی بوویە دوژمن ؟
تۆڵەی چ دەسێنی دێیتە گژ من!

مەم ببووە بەشم ئەوەند بەقینی
هێشتا بە منت ڕەوا نەبینی

تۆ تاقە مەم ـ ێک بە زۆر بزانی
لێم بدزی، برادەری دەزانی ؟

تۆی ئاگری هەڵدەکەی لە کوڵمەم
تا گڕ بگرێ بە من دڵی مەم

خوێن شیرن دەکەی مەم ـ ێ لە زین ـ ێ
تا بیخەیە بەر گڕەی ئەوینێ

سوودت چ وەچنگ کەوت لە بندا
ئەو قۆزە کوڕەت نیشانی من دا

بۆ تووشی کچێکی وەک منت کرد
سووچم چ بوو پاشی بۆ ونت کرد

دوو دڵ کە بە ئاگرت پرووکان
چیت پێ گەیی تۆ جگە لە تووکان

لای هەر کەسێ بەزم و پێکەنینە
هەر لای من و مەم شەپۆڕ و شینە

دەردی دڵی خۆت بە من ببێژە
هەر ژەهرێ کە پێتە ڕۆی بڕێژە

تۆ یۆسف ـ ی من دەخەیتە چاڵێ*
گوێ نادەیە ئاخ و ناڵە ناڵێ

*یۆسف ـ ی ناو چاڵ = ئاماژەیە بە یۆسفی کوڕی یاقوب کە براکانی دە چاڵاویان هاویشت.

بووی تانە لە چاو* ، لە دڵ کەساسم
هەر چاوەڕوانی بۆی کراسم*
*تانەی چاو = ئاماژەیە بە کوێر بوونی یاقوب لە تاوی یۆسف.
*بۆی کراس = ئاماژەیە بە کراسی یۆسف کە یاقوبی باوکی بۆنی پێوەکرد و بە بەرامەی کراسی یۆسف، چاوەکانی بیناییان هاتەوە.

من بوومە گەدایە چاو لە ڕێگە
بێ یۆسف و بێ پەنام و جێگە

یان بیری لە دەوری مەم دەهاڵا
دەم دەم دەگەڵی دەکرد سکاڵا

پێت وا نەبێ من بەبێ تۆ خۆشم
سەدهێندەیی تۆ منیش پەرۆشم

ئارام نییە ڕۆژ و شەو لە دووری
سووچی منە، باشە لێم ببووری

بەو خوایە کە وا لە ژووری سەرمان
دەس ناکەوێ لێم بزێک بە دەرمان

هەر ناوە، کە ماوم ، خۆم نەماوم
بێدارییە بۆتە کاری چاوم

ڕۆژان و شەوان لە چاوی گریان
خوێناو دەڕژێ هەناوی بریان

سوێراوی سروشکە بۆتە شەونم
خەو نایەتە چاو کە بێیە خەونم

ئەو زین ـ ێ کە دیوتە وا نەماوە
ژاکاو پەڕ و، پەلکی هەڵوەراوە

ئەم جۆرەیە دەردی من شەو و ڕۆ
بێ تۆ ئەوە ژیانمە، ئەدی تۆ ؟

لەو جێگەیە کێیە هاونشینت
چۆن دەیبەیە سەر بە دوور لە زین ـ ت

هیچ کەس هەیە ئاخۆ بت دوێنێ
تووشت بووە یار و خەمڕەوێنێ

گیرۆدەیی ئێمە! چۆنە بەندت ؟
تۆش کەوتووە بار لە لێوی قەندت ؟

ئەی دڵ وەرە دەر لە لەش بەبێ هەست
ئەی گیان وەرە بیخە سەر لەپی دەست

پارێزێ بکەن گەلێک لەو و لەم
چووستی بکەن و بڕۆنە کن مەم

لە زمان منەوە بەرن پەیامێ
بۆم بێننەوە زوو لە مەم وەڵامێ

داخوا لە چدایە یاری دڵدار
ناوی منی جارێ دێتە سەر زار

داخۆ لە گەڵم تەبایە یان زیز
لەو کوڵمە گەشەی نەبۆتە پایز؟

ئێستەش وەکوو سوورگوڵی بەهارە
یان وێنەیی بولبولی هەژارە

کۆشک لەمە بۆتە بەندیخانێک
پێم خۆشە کە هەڵکەوێ بەهانێک

هەر چۆنێ ببێ هەلێک سەری دەم*
خۆشتر لە بەهەشتە چاڵ، لەگەڵ مەم
*سەری دەم = سەری لێ هەڵێنمەوە ، سەردانی بکەم.

خۆزیا لە منیش قەڵس ببا میر
وێڕای مەم ـ ی پێم دەخستە زنجیر

هەر جارەکی تر مەم ـ م بدیبا
گوێم لێ نەبووبا، ببا هەچی با

چەند خۆشە لە کاتی گیانەڵاوم
پەنجەی مەم ـ ی لێک نێ پەلکی چاوم

****

## تاژدین و برایانی

پیرێ کە لە دەردی دڵ ببوو پیر
خۆش گفت و شیار و زیت و دڵگیر

ئاگا لە جیهان، گەڕاوی شاران
گێڕایەوە سەرگوزەشتی یاران

گیرانی مەم و گرینی زین ـ ێ
وەک ئاگرێ کەوتە ڕووی زەمینێ

هەر تیرە و هۆز و ڕێز و چینێ
هەر خێوی ئەوین و دڵبرینێ

کێ ببوە زەدەی دەسی ئەوینێ
بۆ ئەو دووە کەوتە کۆڕی شینێ

ئەم ئاگرە تەنیەوە لە لاوان
سووتا دڵی دڵتەڕان لە تاوان

پێی چوون ئەوی دۆستی دوور و کۆن بوون
تاژدین و ستی مەپرسە چۆن بوون

بۆ زین ـ ێ بە دەردێ چوو بوو ئەستی
گریان و شەپۆڕ بڕی بڕستی*
*بڕی بڕستی = هێز و تاقەتی لێ ئەستاند.

تاژدین کوڵی مەم بە جۆرێ گەستی
شێت بوو، دڵ وهۆشی چوو لە دەستی

هاواری دەبردە بەر برایان
ئێوە و دۆسی پیر و کەیخودایان

مکلەچ هەموو ڕوو لە کۆشکی شا کەین
با بۆ مەم ـ ی چارەڕەش تکا کەین

میر بەشکە نەرم ببێ بە جۆرێ
لە گوناهی مەم ـ ی هەژار ببوورێ

عارف وتی: ئەو لە ژیری دوورە
دەوپێکی پلاری شەرم و شوورە

کارێکی نەبێتە چنگ بە گەرمی
بێهوودەیە نووکە نووک و نەرمی

خۆتان دڵی مەزنو* بەش دەناسن
کێ بیستی بە فوو نەرم بێ ئاسن
*مەزنو = مەزنەکەتان ، پاشاکەتان.

پێک نایە شتێک لە کۆڕ و دیوان
مەیدان هەیە لێی ببیتە میوان

کە بمانەوەێ بۆ مەم ـ ێ بکۆشین
پێویستە کە بەرگی جەنگ بپۆشین

چوارئاوێنە* و زرێ دەبەر کەین
خوود* بچنە سەر و پەڕی لە سەر دەین
*چوارئاوێنە = جلکی شەڕکەرانی کۆن . * خوود = کڵاوی ئاسنینی شەڕکەرانی کۆن.

هەڵسووڕنەوە گورزی پاڵەوانان
بسوێنەوە دوو دەمی دەبانان

یان مەم دەبێ بێتە دەر لە ناو چاڵ
یان هەر سێ دەخەینە چاڵ سەر و ماڵ

میر ئەو دەمە باش نەهاتە پێشێ
هەر یەک لە مە شیری دەربکێشێ

تاقییان کەنەوە لە لاشی بەکر ـ ا
نەگ ئەو سەگە با!* لە مەم چ دەکرا
*نەگ ئەو سەگە با = ئەگەر تێچاندنی بەکر مەرگەوەری نەبوبا...

ئەو بەکرێ بە خەنجەران لەت و پەت
بۆ تۆڵەیی مەم دەبێتە دەرفەت

میر بێت و لەسەر سەگی وەدەنگ بێ
پاداشتی کڵۆیە گاشە سەنگ بێ

هەرسێکی مە ئاشی جەنگ دەگێڕین
وەک دەنکە گەنم سەران دەهێڕین

هەرچی وتی(لەل)* بجنرێ پەل پەل
هەر سەر کە بزووت بچێتە شاکەل
*لەل = مەبەست دەنگ لە دەم دەر هاتنە.

سازکەین لەهی*، یەک گەڕەک لە خوێنێ
کێ سەر بپەڕێنێ بیفڕێنێ
*لەهی = لافاو ، سێلاو.

بدڕێن بپەڕێن بە شیر و نێزان
سواران و سەران زگان و ڕێزان

ئەو چڵک و گەماری زۆری زۆرێ
لاناچێ بەخوێنی گەش نەشۆرێ

پاکەینەوە جێ لە نالەباران
بیکەینە جەژن لە ناو هەژاران

دیل بێنە دەرێ لە کۆت و پێوەند
دیلان بگەڕێ و ببێتە گۆوەند

نازدار و جوان لەسەر تەلاران
«دەست و نەزەرێ»ی بلێن هەزاران

بۆو بێو* ببیەن لە نازەنینان
چەپڵە و گوڵ و دەنگی ئافەرینان
*بۆو بێ = بۆتان بێ ، بۆلاتان بێ ، بە گوێتان بگا.

تاژدین و چەکۆ لە ئەم وتارە
زانیان جگە لەو نییە چ چارە

****

## ڕاسپاردە دەنێرنە لای میر

کاتێ شەوەکی شەوی بەڕێ کرد
ڕۆژ زینی لە پشتی ئەسپی شێ کرد

ئەسپی ڕەشی شەو برایە سەر خاو
شێی زەردەیی تاوی خستە پڕ تاو

گرتی دەسی گورزە ئاگرینێ
زەرد بۆوە لە ترسی گۆی زەمینێ

کێشای لە کەمەرگە تیغی زێڕن
نیسێ دەڕەوین کە خۆ وەشێرن

تاژدین و برای لەگەڵ گزینگێ
ئامادیی کار و سازی جەنگێ

شمشێر لە کەمەر، جگەر وەکوو شێر
کێشرانە دەرێ ئەسپ لە پشتێر *
*پشتێر = تەویلە.
ئەسپانی ڕەسەن عەرەب نەژادان
پێت وابوو فڕین لەخۆ حەوادان

ڕەخشان بە چەپۆک و کۆڵ و سمکۆڵ
پێیان دەهەژا دڵی چیا و چۆڵ

خاریان* دەدڕی و دڵی نزاران
بۆ ناشتنی جەندەکی نەیاران
*خار = تویژی ڕەقی خاکی ژێر کێڵگە.

زرم و کوت و هەوهەو و گوڕاندن
هەرکەس لە خەوا بوو ڕاپەڕاندن

گوتیان بە کوڕان بەرەی کەس و کار
یان بمرن و یانە مەم بێ ڕزگار

وا گەردەنی ئێوە دەکرێ ئازا
خۆشی لە کوڕێکە بمرێ ئازا

تاژدین یەکی خزم و کەیخودا و ژیر
لە کوڕانەوە ڕای سپاردە کن میر

تا کەنگێ! بەسی بێ زۆر و بێداد
دۆستان کز و دوژمنان دەکا شاد

پێی وا نەبێ مەم گوناهبارە
دیلی دەسی دڵیە ئەم هەژارە

نازانێ کە پاتشای ئەوینێ
دایگرتووە ڕووی هەموو زەمینێ ؟

دڵداری لەسەر کەسێک ببێ زاڵ
چاوبەستەیە، گوێ کەڕە، زمان لاڵ

ئێمە کە لە گەڵ مەمـ ـا چوارین
بۆ بەختەوەری وی چوار دیوارین

هەر چوار سەری مە هەمیشە وەک گۆ
ئامادە و چاوەڕێی شەقی تۆ

یان دەربکەوێ لە بەند برامان
یان بەکر ـ ێ بنێرێ بێتە لامان

چیمان لە دڵایە پێی ببێژین
تۆزێ کوڵ و کۆ بەوی دەڕێژین

نایکا گلەیی لە خۆی دوا جار
ناخۆشی ئەگەر ببێتە سەر بار

****

## میر لەبەریان دادەنوێنێ

ڕاسپاردە گەیاندی ڕاسپێری
جێیەک نەبوو بەکر ـ ی لێ وەشێری

بۆ کەوڵە، دەبینێ ڕاوی ڕێوی
چاڵێکی دەکۆڵی کەوتە نێوی

داخوازی ژیانی شیری ڕووتە
چاری نەبوو کەوتە کلکە سووتە

میرم: وتی شل بچۆرە پێشێ
نابێ دڵی ئەم کوڕانە بێشێ

زۆر حەستەمە بێنە بەر هەڵستت
نەرمی کە، نەکەی دەچم لە دەستت

فەموو کە لە ڕێی دوو چاوی تاژدین
بەخشیم مەم و بێتە هاوسەری زین

ئەم ئاگرە دامرێنە جارێ
تا چاری دەکەین هەلێک بە بارێ

کینەت نە هەمیشە ئاشکرا کە
ئاڵۆزی بە هێمنی ڕەها کە

دوژمن کە لە تۆ پتر بەهێزە
جێ مەرگی لە باوەش و هەمێزە

پێی ناوێ کە بەرگی جەنگ بپۆشی
ژەهریان لە گەروو بکە بە خۆشی

دوو پیاڵە دەبێ هەبن لە کن میر
یەک شیر و یەکێ ژەهر دەگەڵ شیر

یەک خۆشی لە دۆستان پەیا کات
یەک ژینێ لە دوژمنان جیا کات

یەک فێنکی بدا بە توێی لەش و دڵ
یەک زیندوو بەرێ بکاتە بن گڵ

پێک نایە چ شت بە توند و گەرمی
وەستایی دەوێ و دەهۆ بە نەرمی

سووڕی شەو و ڕۆژ لە نێو جیهاندا
بڕوانە خودا بە مەی نیشان دا

تاریکییە لایە لایە ڕوونە
داینلوە لە بەر مە بۆ نموونە

کارێکی بە ڕۆژ نەهاتە بەر چەنگ
پێک دێ لە شەوی ڕەشا بە بێ دەنگ

ئەو زۆڵی چرووکی دوو زمانە
بۆ میری ئەوەندە ڕست، لە مانە

ڕێی بیری لە پێش بڕی بە جارێک
خونکاری لە بارێ بردە بارێک

هێنایەوە هێندە شێر و ڕێوی
ڕازاندییەوە پیس دڵی و دزێوی

میر ببووە هەسانی* ژێر زمانی
پێی داسوەوە* ئەوەندی توانی
*هەسان = بەردی چەقۆ تیژکردن. * پێی داسوەوە = پێی تیژ کرایەوە.

زوو باوەڕی کرد بە گفتی بەدفەڕ
گەڕناسی* لەبیر چوو،کەوتە سەر گەڕ
*گەڕناسی = ئازایەتی، بوێری.

فەرمووی بە سپاردە، بێژە تاژدین
من بۆچمە بێ ئەوان سەر و ژین

ئەو مایەیە بۆ شکۆە و بەختم
لەو ڕایە کە خێوی تاج و تەختم

ئەو هۆیە کە من بڵیندە ناوم
لێم ببڕێ منیش لە ژین بڕاوم

گەنجینەم و هەژدیهامە تاژدین
تاریکە شەوم، چرامە تاژدین

خۆی دانێ وەکوو برابەشی من
زین و مەم ـ ی ویستووە، پێشکەشی بن

چی خواستووە من بەجێی نەهێنم؟!
لێم زیز بووە، من سەیر دەمێنم!

هەرچی بە دڵ و دەمی ئەوا بێ
بڕیار بێ دەس و لە جێ ڕەوا بێ

ڕاسپاردە گەڕاوە کن برایان
گێڕایەوە گفتی میر لە لایان

شێرانی بە کینە وا نەرم بوون
بۆ میر بە نزایە سەرگەرم بوون

****

## بەکر داوی مەرگ بۆ مەم دەنێتەوە

ئێوارە کە ڕۆژ چرای کوژاوە
پەردەی ڕەشی شەو کە دادراوە

عاسمان وەکوو سێڵی پڕ لە پشکۆ
ئەستێرە تێیا درەوشی کۆ کۆ

ئەو میری هەمیشە شاد و دڵخۆش
ئەو ڕۆژە پەرۆش و مات و خامۆش

دڵپیسی گڵاوی زۆڵی بەدناو
مەزنی بە کزی کە هاتە بەر چاو

گەورەم! وتی: دامەنیشە خەمبار!
کار وانییە بۆت نەیێتە بەر بار

دەخوازی کە شادی بێتە داوێ
تۆ، زین و مەم ـ ێ لە دڵ دەراوێ

هۆی ئاگری کێشە ئەم دووانەن
ماکەی کوڵ و دەرد و خەم ئەوانەن

گەر ڕێگە بدەی گەڕێکی وا کەم
بێ کێشە مەم ـ ی لە ناخێ ڕاکەم

ژەهراوێ لە تۆ کە لێی نەکەن سڵ
تاژدین و برای دەخاتە بن گڵ

کارێکی کە پێک دێ سووک و هاسان
پێی ناوێ هەرا و گوڕین و ڕاسان

تۆ هەستە بڕۆ بڵێ بە زین ـ ێ
مەم بۆتە خەڵووز لەبەر ئەوینێ

مەم تینووە، تۆی کە ئاوی ژینی
هەتوان دەسی تۆیە بۆ برینی

تۆ خۆت هەرە مەم لە چاڵ دەرێنە
ئەو بەندی لە دەسیە بیچڕێنە

زانیومە کە مەم گەلێ نزارە
پەروانەیی ژارە چاو لە یارە

هەر چاوی کەوێ بە زین ـ ی چاو مەست
ناژی دەمێ، گیان دەدا دەمەودەست

سووتاوە، زوخاڵە جەرگ و ناوی
خۆ ناگرێ لە حاستی مەستی چاوی

بەو بۆنە گیانی مەم بکێشە
ژێر گڵ بکە ماکی دەرد و کێشە

سەردار هەنە باش و کار دوروستن
کەمیان ئەوەیە کە گوێ لە مستن

خۆش باوەڕ و سادەیی لە باوان
ڕێشاندەرە بۆ گوناە و تاوان

گوێ نادەنە دڵ کە زۆر بە جێیە
گوێچکەی دڵی وان بە دەستی گوێ یە

بە گلێنە سپین گەلێکی چاو ڕەش
پیسان بە جوان دەگرنە باوەش

باوەڕکەری پیاوی دوو زمانن
ڕاست لار و، خوار بە ڕاست دەزانن

چییان پێ بڵێ هەر دەڵێن بە چاوان
نایکۆڵنەوە بیخەنە بناوان

خۆ ڕانەگرن ، دژن، بە کینن
هێمنایی و پشوو بە کەم دەبینن

گوێ نادەنە ڕاستی و درۆیان
زوو بایی دەبن بە بیری خۆیان

کاریان دەسپێرنە دەست چرووکان
بێ بنیچە و هیچ و پووچ و سووکان

دەزگای مەزنان کە ڕژد و بەدفەڕ
لێی کۆوە بوو، بوو داری بێ بەر

سەرداری کە خێوی بیر و هۆشە
بۆ چینی هەژار دڵی پەرۆشە

باش تاقی دەکاتەوە دەراوان
دانانێ لە دەوری خۆی گڵاوان

چل جار دەگرن، چەلێکی دەبڕن
گۆشتێکی گەنیوە چۆنی دەکڕن ؟

هەرکەس کە دەبێتە کاربەدەستێ
با هۆشی هەبێ و بە خۆی بوەستێ

لەو گفتی ژیانی گەل دەکەن تاڵ
با گوێ کپ و کەڕ بکا و، زمان لاڵ
****

## میر بەم بیرەوە دەچێتە لای زین

زانایی شیار و ژیر و بیر ورد
وای پەردە لە ڕازی میر وەلا برد

شۆڤار کە ببوو بە ڕێنموونی
بەم بیرەوە چوویە ئەندەروونی

دڵداریی زین ـ ی داوە تاوێ
فەرمووی کوڵ و کۆ لە دڵ دەراوێ

تا ئێستە ئەوەی کرا، بڕاوە
ئازاری مەم ـ م بە هیچێ داوە

بە خواری بزووتمەوە لە گەڵتان
بمبوورن و مەیگرن لە دڵتان

ئەم کارە کە کاری سەربەخۆ بوو
تۆزێکی گوناهی چاوی تۆ بوو

بێچارە ئەوەندە چاوی لێت بوو
هۆش و دڵی لا نەمابوو، شێت بوو

بیستم لە بژیشکی ژیر و پڕ بیر
شێت چارە دەکرێن بە کۆت و زنجیر

ئەو میوەیی کاڵ بوو خستمە چاڵێ
ماوەی گەیینم گەیاندە ساڵێ

خۆشتر بووە ئێستە تێک گەیشتن
جوێ نابنەوە کاتێ پێک گەیشتن

وا ئێستە کە بوونە یەکدڵ و گیان
بۆ یەکتری هەر دوو بوونە بریان

نرخی دڵ و دڵتەڕی دەزانن
دڵ چەسپی یەکن، لەبەر دڵانن

ڕێتان دەکەوێ ببن بە ئاواڵ
یەکتر بمژن لە جێی دەمی تاڵ

دڵداری لەسەر وە پاتشاهە
مەم سووچی نەکرد و بێ گوناهە

سەرکۆنەیی مەم ئەگەر بکەم من
پێم وایە خودام دەبێتە دوژمن

مەم بوو بە ئەوینی تۆ گرفتار
جەرگی بە بژانگی تۆ بریندار

تیری دەسی تۆی لە دڵ چەقیوە
کوڵمت دڵ و هۆشی لێ دزیوە

تا تۆی نەبوو چی نەبوو لە پێشا
ئەم سورمەیە کێ لە چاوی کێشا ؟

بسکت وەکوو ماری ڕەش مەم ـ ی گەست
پرچت دەس و پێ و دڵی ئەمی بەست

زنجیری کەزێت لە گەردنی خست
گیان و دڵی بۆتە بۆتە پێخوست

تۆ کرتە نچێری بازی چاوت
خاوپێچە بە تاڵی بسکی خاوت

هەر خۆت بچۆ لای و بیدوێنە
زنجیری لە دەست وپێ دەرێنە

ئەی خونچەیی سوورگوڵی نەپشکووت
ڕزگار بکە بولبولت، ببن جووت

ئەو تینووە چاوەکەی فوراتێ
تۆی وا بکە ئاوی تۆی بگاتێ

ئەی ئاوی ژیان بچۆرە کن مەم
هەر نامرێ کە پێتی تەڕ بکا دەم

زین ـ ێکی دووسەت برین لە جەرگی
بەم واتەیە کەوتە گێژی مەرگی

ئەو ئابڕومەند و خێوی شەرمە
ئەو دڵ بە ئەوین کوڵاو و گەرمە

لەم گفتە کولایەوە برینی
یەکجارەکی هاتە جۆش ئەوینی

خۆێناوی دڵی لە چاو سەری کرد
زووخاوی هەچی هەبوو دەری کرد

دڵداری بە پێلی* چەشنی دەریا
شەرمێونی پەردە بوو لە بەریا
*پێل = شەپۆل.

لەمپەر کە وەلابرا لە نێوان
سەر ڕێژ بوو زوخاوی دڵ لە لێوان

دەریای کەسەری کە هاتە سەر جۆش
بە کوڵێکی بە گوڕ پەڕاندی سەرپۆش

وای زۆربە* ستاند شەپۆلی خوێنێ
کەم مابوو کە خۆشی ڕاڕفێنێ
*وای زۆربە ستاند= تەوژمی ئەوەندە بەرز بۆوە.

ئاومالْکی* ڕقی دڵی ڕەقی میر
پا بۆوە چڵک ، چڵێ نەبوو گیر
*ئاومالْک = ئەو پڕ و پووشەی کە ئاوی سێڵاو دەگەڵ خۆی دەی هێنێ.

دووی *ئاگری جەرگی زین ـ ی برژاو
باراندی لە چاوی میر تکەی ئاو
*دووی = دووکەڵی.

پێت وابوو هەژار هەزار پیشە
مەی سوورە ڕژا لە زارە شیشە

پا بۆوە دڵی لە کێمی کینێ
گرتی بەزەیی بە دەردی زین ـ ێ

زین بێ دڵ و دەم شەڵاڵی خوێنێ
بێهوودە بوو ویستی بیدوێنێ

گریا لە سەری درێژ شەوگار
کۆبوونەوە لێی بەرەی کەس و کار

وتیان ئەمە چی بوو، بۆچی کوشتت ؟
ئەم خوێنە بەجێ نەبوو کە ڕشتت

زین گوڵبنی باخی شەرم و پاکی
زین ـ ێ لە جیهان کە نەبوە تاکی

بێ سووچ و گوناه پاک و خاوێن
هەرگیز نەکەوت پەڵەی لە داوێن

ئەو گەوهەری شەوچرای جیهانە
چۆن وردی دەکەی بە بێ بەهانە ؟

کەی وابووە مەزن و پاتشاهێ
هەڵکاتە هەژار و بێ گوناهێ

بەمجۆرە دە خاک و خوێنی ڕاکا
بەم زۆرە گیان لە لەش جیا کا

چی ئێوە دەڵێن؟! وتە: نە وایە
کەی کوشتنی زین بە من ڕەوایە

کوشتەی مەم ـ ی بێکەس و هەژارە
بۆ یارە نەخۆش و گەشکە دارە

زین تاقە گوڵێکی باغی شاهی
من چۆن لە دەسی دەدەم هەوایی

دەستەی کەس و کار بە جارێ شێوان
ئەسرین لە دوو چاو و بار لە لێوان

بوە شین و شەپۆڕ لە ناو جوانان
هاوار دەگەیشتە عاسمانان

لەپڕێ وتی: یەک، دەهات لە ڕێوە
مەم مرد و ژیانی دا بە ئێوە

زین پێشێ کە مرد بوو ژیاوە
هەستا و لە سەرینێ پاڵی داوە

دەپڕوانی لە هاودەم و لە یاران
دی میر دەگری بە تاوی باران

هەرچی کەس و کارە دەردە دارە
خەمبارە، هەژارە لێو بەبارە

ڕووی کردە برای، وتی سەری من:
گۆڕی تە، کە بویتە ڕێبەری من

گیرا بوو گیانی من لە لەش دا
مابوو وەکوو مەم لە چاڵی ڕەش دا

هەر چاوێ لە لێوی تۆ بە جارێ
چارێکی بکەی کە پێی بچارێ

بۆ هێشتنی ئابڕوو، دڵی تۆ
دەرچوونی نەدی هەتاکوو ئەمڕۆ

وا ئێستە کە خۆت ڕچەت نیشان دا
گیانم دەفڕێ بە دووی گیان دا

ڕۆژی ڕەش و لەش لە ئاو، خاکی
ڕابرد و گیان گەیشتە پاکی

چەندەی لەشەکەم لە خۆی وەڕەز بوو
گیانم دە ئەوەند زەبوون و کز بوو

ڕێی دەر نەدەکرد لە دەرد و ئێشی
گیانی مەم ـ ی گەییە کەوتە پێشی

دەرچوون لە جیهانی پووچ و بەر باد
وا گەینە ژیانی خۆش و ئازاد

بەربوون لە کەمەندی دوو زمانان
دەستەملی یەکن لە عاسمانان

گیانێکی کە پاک فڕی لە سەر جێ
بێ جێ نییە، جێی هەیە لە هەر جێ

هاوجووتی یەکین مەڵێن جودا بوون
بووکنی مە فریشتەیی خودا بوون

گیانی مە کە پاک و پاک ڕەوشتن
ئەمڕۆ لە بەهەشتێ پێک گەیشتن

وا ئێستە بە جارێ دڵنیا بوون
مانیان نەمرە و نەما جیا بوون

تینوو لە زەوی کە ماوە لەشمان
دەریای بەزەیی خودایە بەشمان

قاپێلکی گڵین کە خاکەسەرمان
گیانمان گەیینە هەواری هەرمان

ئیتر نییە ترس و خۆ وەشاردن
نە ژیانی خوشک بە کاک سپاردن

نەتوانەوەیە لەوێ و نەگۆڕان
مایەی ئەوێ بێبەشە لە دۆڕان

تۆزی مە گەیشتە ڕۆژی ڕۆشن
ئەم خۆشن و ئێوە بۆ پەرۆشن؟

مەیکەن بە کر و هونەروەریی من
مەم پێشڕەوە بۆتە ڕێبەری من

ئەو پیرێ کە من دەسم بەوی دا
چیم دیتووە؟ ئەو نیشان منی دا

گەرچی لە ڕواڵەتا گەدا بوو
زۆر پایەبڵندتریش لە شا بوو

جێ بەرزە لە بارەگای خودایی
پێخوستیە تانجی پاتشاهی

گیان و دڵی بۆتە شیوی پیرۆز
بێ ترسە لە گێژ و تۆز و باهۆز

کێشای دەسی من بە ڕێی ئەوینا
دوای کەوتم و گەیمە کێوی سینا

مەم بوو لە بەزەی خودای گەیاندم
ئەم بوو کە لە گێژی ڕای پەڕاندم

هێنامیە دەرێ لە پەردەکەی خاک
پاکانەمی کرد لە کن خودای تاک

پێو وانەبێ من ئەوێستە زیندووم
لەو کاتەوە مەم نەماوە مردووم

خوازرایەوە ئەو گیانی ئێستە
مەم پێم دەڵێ تۆزێ تر بوێستە

ماڵاوا بکەم لە ئێوە گشتوو
پێی خۆشە خەموو نەبێ کە کوشتوو

تەنیا هەر ئەوەندە ڕاسپێرن
تەرمی مە بە ناو و داو وەشێرن

دیسان دەگەڕێمەوە بەهەشتێ
هەمدەم بە مەم ـ م لە بەزم و گەشتێ

****

## دوایین ڕاسپێری زین

ڕاسپێریی زین ـ ێ وا بوو بۆ میر
ئەی مەزنی بڵیند پایە و ژیر

گۆڕیت بێ گیان و دڵ سەر و ژین
هەر دەم دەبەرت مرن دوو سەت زین

ئەو یەکدوو هەناسە دوا پشووی من
هیوام هەیە خەم نەخۆی لە دووی من

هەر ڕۆژی بەرێ کە من مەم ـ م گرت
شەشدانگی کەساسیی و خەمم گرت

لەو ناوچەیە خێوی دەستەڵاتم
پەیدا بووە بۆم لە ڕێی خەباتم

مەم بۆ من و کامڕەوایی بۆ تۆ
خەم بۆ من و پاتشایی بۆ تۆ

چاوت لە بەشم نەبێ کەسی من
بۆ تۆ هەموو شت، کزی بەشی من

دانیشە لە تەختی سەروەری خۆت
لار دابنێ تانج لەسەر سەری خۆت

سازی بدە بەزمی کۆڕ و ئاهەنگ
گۆوەند بگەڕێت و چەنگ بدا دەنگ

سەرخۆش بکە سادە و ڕواڵان
دڵخۆش بکە پیر و کەونەساڵان

گش مایەیی بەزم و شادومانی
چی خۆشیدەرن بە زیندەگانی

لە خواردن و خواردنەوە ببن ساز
دەنگ داتەوە دەنگی ساز و ئاواز

ئازاد بکرێن کەنیز و بەندان
ڕزگاری دریٚ بە دیل و بەندان

پەخشان بکە زێڕ و پوڵ و پاران
کۆیان بکەوە گەلی هەژاران

لێم خڕکەوە پۆلی نازەنینان
خوێن شیرن و دەم بە پێکەنینان

جوان بێن و بچن لە دەور و بەرمان
با بێنە سەما لە دەوری تەرمان

با گەورە و کەیخودا لە ناوا
پیرۆزی بکەن لە بووک و زاوا

بۆنخۆش و گوڵاو بڵا گەلێک بن
پێویستە پتر لە هەر شتێک بن

بۆ ئێمە نە باوی ئاو و خاکە
پێک گەشتنی دوو گیانی پاکە

لەشمان کە دەچێتە گوڕ و چاڵێ
گیانمان لە بەهەشتێ لێک دەهاڵێ

لەو بەزمە فریشتە تێدەکۆشن
داخوازی بەرام و بۆنی خۆشن

ڕۆژێ کە ستی ـ ت دەدا بە تاژدین
ئاواش بکە ئێستە بۆ مەم و زین

بازاڕ و شەقامی شار و دەم چەم
با جوان بکرێن بە چەشنی ئەو دەم

با دەرچنە دەشتێ شۆڕەسواران
ڕمبازی بکەن بە یادی جاران

بۆتان ـ ی لێیان ببێتە جێژن
دڵخۆش بن و لاوکان ببێژن

وەک ئەودەمە خۆت ستی ـ ت بەڕێ کرد
چۆنت بە دڵی مە جێبەجێ کرد

هیوامە لەگەڵ منیش وەهابی
بۆ میش وەکوو ئەو، چرا و برا بی

بۆ تەرمی منیش دوو سەت ئەوەندە
دڵخۆش بیی و شادو دەم بە خەندە

پێشمان خە گۆرانیبێژی خۆشدەنگ
ڕێکیان خە بە چەپک و بەزم و ئاهەنگ

دەربەستێ وەکوو کەژاوەیەک بێ
جێی دوو کەس و تاقە چاوەیەک بێ

زێڕکفتی بکەن هەمووی دەر و ناو
بترووسکێ لە دوورەوە لە بەر تاو

پەلکی گوڵی ڕابخەن لە ناوا
دڵیان لە گوڵانە بووک و زاوا

بمگوێزنەوە چەشنی بووکی شایان
کارێ مەکە سووک ببم لە لایان

کیژۆڵە بە دڵپڕی نەبێژن
زین ـ ێ نە بە ناو و دڵ دەنێژن

بەزمی ستێ خۆش و ڕۆژی گەش بوو
زین مردن و ژینی چارەڕەش بوو

با ئەستی جل و خشڵ دەبەر کا
خۆی بێت لە گەڵم، گڵم وەسەر کا

تاژدین دەری خا ئەسپ لە خاوا
سوار بێ و بچێ شان بە شانی زاوا

مەم چۆن بوو کە ئەو ستی درایە
مەم بێکەسە هەر ئەوی برایە

لەم ڕۆوە ئەتۆش هەیا* بە ساڵێ
هەر ماڵێ کە دەر دەخەی لە ماڵێ
*هەیا = هەتا ، هەتاکو.

هەر خواردنێ دەیدەیە هەژاران
هەرچێکی بەخت دەکەی لە یاران

چەند داڵدە دەدەی بە پێ پەنایان
دەس پڕکە بەڕێ دەکەی گەدایان

هەر بەرگێ دەکەیتە بەر شڕۆڵان
پێت دێنە گەشە و بزە کڵۆڵان

هەر چەندە دەبێ بە کەس لە بێکەس
هەر ڕۆژێ کە دەگری دەستی بێ دەس

هەرچەندی دەگەی بە دادی داماو
ئەسرین دەسڕی لە چاوی گریاو

هەتوان کە دەخەیتە سەر برینێک
شادی کە دەدەی بە دڵ خەمینێک

دیلان کە وەدەر دەخەی لە زیندان
دڵخۆشی دەدەی بەوەی لە شین دان

تا پێت هەیە پیتی کوردەواری
چەند هەڵدەکەنی ڕەگی هەژاری

دەرمانگە و فێرگە، ڕێگە و پرد
مزگەوت و میوانگە چیت دروست کرد

چەند ڕێز دەنرێ لە تەخت و تاجت
چەند کۆوە دەبێ پیتاک و باجت

مانگانەیی کاربەدەست و نووسەر
پێشمەرگە و ئەفسەران و نۆکەر

چەند خوێنێ لە دوژمنان دەڕێژی
هەرچەندی کە خوێنمژان دەنێژی

تاڵان و بڕۆ لە دوژمنی کورد
چی دێتە دەست هەمووی گڕ و ورد

با گشتی لەسەر نیازی من بێ
وای دانێ بە ناو جیازی من بێ

پێم ناکرێ هیچ بەرم لە گەڵ خۆم
پاش بارێ بڵان بەڕێ کرێ بۆم

شانازی بکەم لە کن ئەو و ئەم
کەس نەیژێ شتی کەمە ژنی مەم

پەردووی مە ئەگەرچی گۆڕی تەنگە
بۆ بووکێ کە با بە چەنگە نەنگە

ئەو جێگەیە دوور لە بەژن و باڵات
بۆ ئێمەیە جێی نیاز و ئاوات

ڕاسپێری کە زۆرە لێم ببوورە
یەکجارییە کۆچ و ڕێگە دوورە

چەندی لە دەسـ ـت دێ زۆر ئەگەر کەم
دەرماوێ لە بیری خۆت من و مەم

خزمایەتی مەم بە کەم مەزانە
مەم تاج بەسەرێکە لەم جیهانە

تەرمێ کە دەچێتە گۆڕەخانان
هەڵدەگرێ هەڵی گرن بە شانان

هەرچەندە منیش لەلای ئەوە جێم
بۆ گۆڕ و بەرەو مەرگ بە پێ دێم

خواکەی نەچی چیدی بێ بەشم کەی
لەم مردنەشا بەخت ڕەشم کەی

بم نێژە لە ژێر گڵا دەگەڵ مەم
ڕوومان لە یەک و دەسی لە مل کەم

میوانی مەم ـ م چ خۆشە مردن
بۆ ئێمە نە جێی پەرۆشە مردن

میر کەوتە گرین و داد و ڕۆ ڕۆ
فەرمووی دڵەکەم سووتاوە بۆ تۆ

سوێندم بە خودای خۆیا* و نەدیوان
بۆ ئێوە لە دڵمەوەم پەژیوان
*خۆیا = ئاشکرا، ئەوەی کە بە چاو دەبیندرێ.

خۆت هەستە سەرێ دە بیدوێنە
بیهێنە لە مردنێی بسێنە

زیندوو بن و بچنە ناخی خاکا
کەس نابێ لە یەکتروو جیا کا

****

## زین لە ژوور سەرینی مەم دا

زین ئەو بەزەیی لە ڕووی برا دی
سەردانی مەم ـ ی گەلێ ڕەوا دی

ڕازایەوە هەر لە پێ هەتا سەر
دەریای لە جوانی کەوتە گەوهەر

ئەستی و بە سەدان لە دیدە کاڵان
ئەستێرە لە دەوری ڕۆژێ هاڵان

چاومەست و بەلەک خڕ و کەزێ شۆڕ
دەرچوون وەکوو دۆڕ دەرێن لە قاپۆڕ

دەروێشە دەچێتە دیدەنی پیر
کوا ماوە کوڕی گەدا و کچی میر

هیوا نە لە کۆشکە وا لە بەندە
دڵ بەستەیە زین و مەم کەمەندە

دەرگا کە کرایەوە لە یاران
زیندان بووە باخی نازداران

چوە سەر مەم ـ ێ بەر لە زین ـ ێ ئەستی
دی مردووە نایە دەنگ و خوستی

گیان چۆتە دەرێ لە بەژن و باڵا
ماڵ بێکەسە ، کەس نییە لە ماڵا

واڵایە قوتووی دوڕی گییانی
کوژاوەتەوە گڕی ژیانی

گوڵزاری وشک بووه بەبێ ئاو
بێ ڕۆنە چرا و پڵیتە سووتاو

پرسی لە کەسانی هاودەمی بوون
هاوبەندی گران و هاو خەمی بوون

وتیان لە دەرێوە هات ترووسکێ
دەرچوو لە سەری مەم ـ یش برووسکێ

یەک وێنەیی مانگ و ڕۆژ ، ئەوی تر
هاڵا ئەوی ژوور لەوی نەوی تر

یەک بۆ یەکێ کەوتە تیشکە ڕشتن
تا بوونە یەکێک و پێک گەیشتن

بەم جۆرە درەوشی سەردەمێ چاک
شەوڕەش لەمە بوو بە ڕۆژی ڕوناک

لەو کاتەوە مەم نەما لەسەر هۆش
پێی خۆش نییە ڕابێ لەو خەوی خۆش

تا چاوی دڵت لە سەریە تانە
پێت وایە کە نەبووە ئەو شتانە

گیان تیشکی خودایە سەربەخۆیە
ڕاگوازتن و توانەوەی درۆیە

خوێن لانەیە بۆی، نە خۆی گییانە
چیدی لە گییان بڵێی زیانە

هاوڕێ کە لە گەڵ (مەمـ)ـا گرا بوون
لەم ڕازە گرنگە شارەزا بوون

ڕێ شاندەری باش بوو بۆ هەواڵان
بردینە دەرێ لە ناو خەیاڵان

ئەستی چووە بن سەری مەم ـ ی ژار
تا کەنگێ دەنووی لەخەو بە بێدار

هەڵبێنە سەرت ببینە زین ـ ت
هاتۆتە بەرت گیان و ژینت

تینووی؟ چووە لەمپەر و لە نێوان
وا ئاوی ژیان و تەڕ کە لێوان

لەم مردووە بەو وتار و باسە
هەڵچوو تەپ و دووکەڵی هەناسە

زین دەستی گەیاندە دەستی یاری
فرمێسکی لە چاوی مەستی باری

ئەسرینی ڕفاندی پووشی شەرمی
سەرپۆشی دڕاند لە سنگی نەرمی

گریەی بە کوڵ و کزەی هەناوان
جەرگی گەڤری ڕەقی دەتاوان

بای گەرمی هەناسەو و هەنسکی
ڕای ماڵی لە دەوری کوڵمی، بسکی

ڕووپۆش کە وەلادرا لە ڕووی زین
ڕۆژ تیشکی گەیاندە مانگی بێ تین

تاریکی مەرگ هەڵات لە جێدا
پێت وابوو کە ڕۆژ هەڵات لە وێدا

ئەی مەم وتی: بۆت گەلێ بە تاسەم
گیان بێنەوە بەر بە بای هەناسەم

بۆی ژیاوە مەمۆ بە گفتی زین - ێ
بووژایەوە بەش بڕاو لە ژینێ

دای تیشکی ئەوین لە ناو دەروونی
هێز کەوتەوە گوڕ، ڕەوی زەبوونی

هەر چاوی کەوت بە مەستی چاوی
تین هاتەوە بەر دڵ و هەناوی

فرمێسکی کە هات بە چاوی ڕەش دا
لەو مردووە بوونە خوێن لە ڕەگدا

ئەی مەم وەرە ڕابە لاوی چابە
خاڵی ڕەشە بۆتە، بۆتە کابە*
*کابە = کەعبە، ڕووگە.

ڕووم تێ بکە! ڕووگە خۆشە من بم
لێو بمژە لەباتی ئاوی زمزم

لەم بەژنە کە نەخشی دەستی خوایە
هەر سووڕێ بدەی حەجت ڕەوایە

باوەش وەکریم* و چاوەڕێی تۆم
مەم چەشنی پەپوولە چوو بەرەو مۆم
*باوەش وەگریم = باوەش ئاواڵەم، باوەشم وازە.

هێشتا نەببوو نزیکی زین - ێ
سووتاندی پەڕی گڕی ئەوینێ

سەرخۆشی یەکن بە ڕەنگ و بۆیە
جێی ڕاز و نیاز و گفتو گۆیە

زین ئێژێ پەپوولە ڕێنومامی
پەروانە وتی تە* شەوچرامی
*تە = تۆ . ئەتۆ.

مەم خۆشی و فێنکی دڵمە ناوت
زین گیانی مەم ـ ی بە گۆڕی چاوت

مەم داومە بە تۆ دڵم بە شەشدانگ
زین دڵبڕی تۆ، بە تیری برژانگ

مەم داوی خەمی مە گشتە بێ تۆ
زین جەرگ و دڵم بڕشتە بێ تۆ

مەم سینەیی من بەهەشتی تۆیە
زین بێ تۆ هەموو شتێک درۆیە

مەم ئەو مەمە سێوی دەستی بۆ تۆ
زین گەردەنی دڵ لە ڕستە بۆ تۆ

مەم بۆمە ئەێستە ڕووگەیە ڕووت
زین بەسیە گییان لە تاوی تۆ سووت

ئەستی و کەس و کار کە بوون لە گۆڕا
خوێنیان لە هەناو و چاو دەچۆڕا

وتیان بدە موژدە بەختە یارت
پێکهاتووە ڕێکە کار و بارت

بۆ زین کە زەبوون ببوو گیانت
گەر میر دەگەڕا لە دووی نەمانت

وا میر بەزەیی دەکاتە پیشە
زین بۆت بووە هاوسەری هەمیشە

وا ئاوی ژیان ئەگەر دەنۆشیت
لوقمان ئەوەتا ئەگەر نەخۆشیت

مەجروون ئەوە لەیلە سەرتی داوە
بۆ دەستەملان فرەی *نەماوە
*فرەی نەماوە = زۆری نەماوە.

بولبول ئەوەتا ئەوی گوڵت بوو
لولوپەڕی* ڕۆژهەڵات پشکووت
*لولوپەڕ = نۆلوفەر، گوڵە لاولاو .

دێوانەیی دەردە، ڕابە چابە
بێگانەیی بەردە، ئاشنا بە

ئەو پەریە کە تۆی بە ئارەزوو بووی
ئەو شۆخی هەمیشە چاو لە دوو بووی

هەرچۆنێ دەهاتە بەر خەیاڵت
دەرچوو لە خەیاڵ و بۆتە ماڵت

دەستت مەخە بەر بەشی خودادا
بێهوودە مەدە ژیان بە بادا

دەم نێ دەمی زین و دەس لە گەردن
ڕابوێرە پەلەت چییە لە مردن ؟

خۆ ژیر کە ڕەها کە کۆت و زنجیر
وا باشە لەگەڵ مە بێیە کن میر

پیرۆزەیە سێبەری لە سەر مە
بۆتان دڵی ئێستە گەرم و نەرمە

ئازایە گەلێ لە چاکە کردن
بەخشندەیە مەردە خێوی بوردن

هەرچی کەس و دۆستە بانگ کراوە
چی مایەی بەزمە ساز دراوە

خۆش بەختیی و خۆشی ڕووی لە تۆیە
میر دوورە درۆیە، ڕاستگۆیە

هەر بیگەیە هیچ دڵێ نەمێنێ
ئاواتی دڵت بەجێ دەهێنێ

زین ـ ت دەوێ چی تریش دەخوازی
دەت داتێ هەمووی بە سەرفرازی

مەم بیستی ئەمانە تۆزێ ڕاما
درکاندی دەمی لە جێی وەراما

لاتان ئەوی مەزن و پاتشایە
لام بێکەس و دیل و بێ پەنایە

تەختی وی بنی لەسەر خەیاڵە
خانووچکەیە جێ گەمەی مناڵە

دەزگایەکی دوور لە مان و پووچە
زیانبارییە جێی گوناه و سووچە

خونکارێ بە مردنێ نەوێرێ
پیاو چۆن دەبێ خۆی بە وی سپێرێ

خۆم داوەتە دەستی پاتشاهێک
بەخشندیە بۆ هەموو گوناهێک

خونکار و هەژار لە لای یەکێکن
ئاکاری بەجێن و ڕێک و پێکن

هاوێنەیی ڕووی زین ـ ی چێ کرد
نەخش و کری خاڵ و بسکی لێ کرد

لەو ئاوێنە دا ئەوم دی جارێک
ئیتر بە کەسم نەماوە کارێک

وەستای من و زین ـ ێ دڵمی ئەستاند
گیانمی لە خەوی نەزانی هەستاند

ئەو خێوی شکۆیە، پاکە، تاکە
بێ مردن و چوون و ترس و باکە

هەر لەو دەکرێ سوپاسگوزاری
خستینێ بەهەشتی نازداری

دەستی بەزەیی درێژە بۆ مە
خۆشیی و گەشیی گشتە بۆ مە

زۆرباش بوو نەگەینە یەک لە ڕووی خاک
مۆرین و دەچین دڵ و دەروون پاک

دوو نۆبەری باخی ناز و خۆشین
مەی پێک گەیینێ لەوێ دەنۆشین

دڵدار کە لە سەر زەوی دەمێنن
زۆریان هەیە تۆوی پیس دەچێنن

داوێن تەڕ و شەرمەزار و سەرشۆڕ
بێ ئابڕوو پەل دەبن بەرەو گۆڕ

گۆوەندی مە خۆشە لەو بەهەشتە
ڕازاوەتەوە پەری و فریشتە

مزگێنی دەدەن لە چوونی ئێمە
شانازی دەکەن بە بوونی ئێمە

کوا ئێمە دەچینە کن فریشتان
جێی ئێمە بڵندترە لە گشتیان

جێی دڵبەر و دڵتەڕان جودایە
بۆ ئێمە ژووانگە لای خودایە

هیوان* هەر ئەوەند هەیە لەلای ئەو
هەرچی زووە بچمە بارەگای ئەو
*هیوان= هیوامان، ئاواتمان.

کاتێ کە نزای لە دەم بڕاوە
دەرگای بەزەیی خودا کراوە

هەروا نەژییا لە ژینی تاڵا
باڵداری گییانی فڕیە باڵا

گیان دەستی لە ئاو و گڵ کە بەر بوو
بە نیازی گەیشت و بەختەوەر بوو

پەروانە لە ڕۆشنایی هاڵا
جێ ما لە زەوی لەشێکی واڵا

****

## شین بۆ مەم

دەیگوت ئەوی شینی بۆ مەم ـ یٚ کرد
ئەو ڕۆژە کە ئەو هەژارە پیٚ مرد

بوو شین و شەپۆڕ لە ناو جزیر ـ یٚ
گش پیاو و ژنێک و لاو و پیریٚ

بۆتان ـ ی لە گەورە تا بچووکان
زاوا و خەسوو، خزوور و بووکان

دارا و نەدار، بڵند و نزمان
زانا و نەزان، نەناس و خزمان

دەروێش و بە ڕیش و مەستی بادە
پاک و بەچڵک ، بە کوڵک و سادە

کوێخا، بەرەڵا، هەڵە، شەل و گێڕ
گشتی وەکوو یەک ببوونە شین گێڕ

چاویان تەڕ و قوڕبەشان ، ڕەشپۆش
پەیدا نەدەبوو یەکێکی دڵخۆش

بێگانە و دوورە دەست و خۆیی
هەرکەس بەرەو تەرمی مەم دەڕۆیی

بۆ شوێنیٚ دەڕۆیی بەکر ـ ی پڕ کین
تا گوم ببیٚ، کەوتە داوی تاژدین

بۆ کویٚ؟ وتی : سیسەماری بەدفەڕ!
ئەی ماکی هەموو بەڵا و گزی و گەڕ

ئەی لەمپەری بەر دڵ و نیازان
پیستر لە هەموو سەگ و بەرازان

ئابڕوو بەری دڵتەڕانی دڵدار
خوێ پێوەکەری دڵی بریندار

کۆستت کەوێ وەک مەم ـ ت لە من کرد
چیدیت دەوێ کەتنی خۆت بە من کرد

ئەو دەردە کە دات بە مەم لەسەر چی ؟
هێشتا دەتەوەێ لە دەست مە دەرچی ؟!

بگرە لە دەسم دەبانی دوو دەم
بت کەم بە یەکەم لە تۆڵەیی مەم

یەک بڕ سەری بەکر ـ ی پێ نەوی بوو
لاشەی سەگی چەسپی سەر زەوی بوو

کاتیکی کە هات بەلای برا دا
ڕووناکی نەدی لە ناو چرا دا

دایگرت لە سەری کڵاو و تۆمار
هاویشتییە سەر لەشی مەم ـ ی ژار

دێوانە و هار لە تاو برایێ
شاڵاوی دەبرد وەکوو زەهایێ

نیازی هەبوو هەرچی بێتە پێشێ
بۆ تۆڵە گیانی وی بکێشێ

کێ لەو دەمە دا ببا تخوونی
پاپای بوو لە مردن و نەبوونی

هاوار لە دەسی برایەکن میر
زوو پێ و دەسی خستە بەند و زنجیر

تەرمی مەم ـ ی کەوتە ڕێ بەرەو گۆڕ
کۆمەڵ لە دواوە مات و سەرشۆڕ

کۆتەڵ کە لە پشتی ئەسپی مەم بوو
بۆ هەرکەسێ ماکی دەرد و خەم بوو

تاژدین ـ ی لە پشت شەتەک درابوو
ئاگای کە لە بردنی برا بوو

زنجیری لە دەست و پێ چڕاندن
دەروازە و بەندی تێک شکاندن

ئەنگوچکی سپی نایە نێو هەش
تەرمی مەم ـ ی گرتە مێز و باوەش

خزم و کەس و کار و دۆست و یاران
گریان لە گەڵی بە تاوی باران

شڵپەی دەس و سینەیی جوانان
دەنگی دەگەیشتە عەسمانان

هەرچی ژن و کیژە پۆڕ کراوە
ڕوویان دەڕنی بەدەم سەماوە

گشتی لەپ و پەنجە سوور و ئاڵ بوون
بێ ڕەنگ و خەنە، لە خوێن شەلاڵ بوون

ڕیزێک لە کچان یەکێک لە لاوان
پێیان هەڵدەگوت بە بەند و باوان

پۆلێک لە دوایەوە لە خۆ دەر
هێندێکی لە پێش تەرم سەماکەر

پیر کەوتنە ناو، بە تاو دەکەن شین
میر دەسرە بە چاو دەبارێ ئەسرین

زین هاتە سەما ، لەپێشی تەرما
چنگی دەکوتا بە سینگی نەرما

پەخشان ببوو مووی بەسەر لەشیدا
وەک ئاوی ژیان لە ناو ڕەشی دا

ئەو کاتێ سەمای دەکرد لە تاو مەم
زوهرە بە سەماوە کەوتە ناو تەم

ڕۆڕۆی کە دەهاتە دەر لە لێوان
لە سوێیی دەتواوە جەرگی کێوان

دار و دەوەنی دەگەڵ دەناڵی
گریانی ژیانی کردە تاڵی

لەو شینە مرۆ ئەوەندە وەکۆ بوو
جەرگ و دڵی ڕێ بە کەند و کۆ بوو

ڕەوتیان دڵی عەرزی پێ دەلەرزی
بوولەرزە دەکەوتە نزم و بەرزی

هێند دادەورەرینە ڕووی وەکو گوڵ
فرمێسکی کچان بە هۆی کوڵی دڵ

پێت وا بوو لە هەورەکەی بەهارێ
بارانە لە سەر گوڵان دەبارێ

چارشێوی ڕەشی ژنان ئەوێدەم
پەیدا بوو، نیشانی شینە بۆ مەم

ڕووپۆش لە ڕووان کرایە پەرژین
ڕەشییان لەبەرایە بۆ مەم و زین

****

## زین بەزەیی بە بەکر دا دێ

دییان کاتێ کە گەینە قسنی* بەر شار
لاشێکی تخێڵ لە بەینی دوو دار
*قسن = دیواری بەردینی دەوری شار، وارشە بەردینەی دەوری گڵکۆی پیاوچاکان.

زانیان ئەوە بەکر۔ ی مەرگەوەڕ بوو
ئەو لاکە کەلاکی ماکی گەڕ بوو

تاژدین ۔ ە سەری لە لەش جیا کرد
کێشەی لە زەوی تەرە و تونا کرد

چیرۆکی بەکر کە گەییە کن زین
پاڕایەوە بۆی لە میر و تاژدین

پیاوچاک لە ڕق و لە کینە دوورن
هەرچەندە بە سووچە لێی ببوورن

بێ فەڕ کە بە چاکە نەدرێ پاداش
جیاوازی بەچی بێ باش و ناباش ؟

خوای سازدەری عەرز و عاسمانان
داینا لە بەرێوە بۆ مەمانان

ڕۆژێ کە ئەوینی دا بە دڵدار
ئەو ڕۆژە بدیشی دا بە بەدکار

چۆن دەکرێ کە پاک لە پیس وشێرن
زۆر حەستەمە لێکی هەڵوەژێرن

لای سوورەگوڵان دڕوو ڕواوە
گەنجێ هەبێ ماری وا بە لاوە

گوڵ سیسه به دوور له دڕک و داڵان
مار هۆیه که گەنج نەچێ به تاڵان

گەر پیسی وەکوو بەکر نەبووبا
هیچ دوور نەبوو ئابڕووی مه چووبا

هەرچەند به ڕواڵه ناتەبا بوو
ڕاستوو دەوێ بۆ مه دۆستی چا بوو

گەر ئەو نەدەبوو به لەمپەری مه
گومڕایی دەبوو به ڕێبەری مه

وا دەر نەدەچووین له شەرمەزاری
پیرۆز نەدەبووین له کوردەواری

ئەو ڕێگەیی پاکی خسته بەرمان
زۆر زۆر ئەمەگی هەیه له سەرمان

هەرچەنده بەخۆی گەیشت زیانی
دۆڕاندی له ڕێی مه دا ژییانی

پێم خۆش نییه هیچ گرێی وەبەر بێ
هیوان هەیه شاد و بەختەوەر بێ

ئیدی بەسه ئابڕووی مەڕێژن
لەو جێی که من و مەم ـ ی دەنێژن

ئەو ببوه سەگێکی پاسدەری مه
با هەر بکەوێ له بەر دەری مه

لای ئێمه بنێژرێ با گییانی
پاسی مه بدێرێ لەو جیهانی

بڕوانه بەزەی دڵ و دەروونی!
ئاوێنه بەزێنه ئەو بە ڕوونی

ئاوێنه و ئاو گەمارێ دەگرێ
کێ بەخشی کەسێ لە دەستی بمرێ؟

هەرکەس کە بەزەی خودا نەبینێ
نەپرووکێ بە ئاگری ئەوینێ

نەکوڵابێ لە ناو ئەوینی پاکا
پێی وایە کەس ئەو شتانە ناکا

پاکان کە بەزەی خودا دەبینن
وەک هۆزی فریشتە دوورە کینن

****

## مردنی زین

دڵ گەستەیی هەژدیهای ئەوینێ
کوژراوی دوو چاوی مەستی زین ـ ێ

گیراوی گوناهی بێ گوناهی
سووتاوی گڕ و دوومانی ئاهی

ئەو تازە نەمامی وا لە بەر دڵ
بەژنی بە نەکامی کەوتە بن گڵ

وەک گەوهەری گەنج بە خاک سپێرا
ماریشی لە پێینیی* وەشێرا
*پێیین = ژێر پێ ، پایین ، خوار پێ.

ئەو کێلی چەقا لەبن سەری مەم
دەیگووت کە سەرم بڵندە، گەورەم

کوا کێلێ کە شان لە شانی من دا
کێ نووستووە وەک مەم ـ ی لە بن دا ؟

شای کۆمەڵ و هۆزی سەرفیرازان
میوانمە، دەبمە جێی نیازان

زین هات ولەدەوری کێلی هاڵا
لێی کردە نیسێ بە بەژن و باڵا

خوێن هەڵدەوەری لە چاوی ئاڵی
دەتوایەوە دڵ لە ناڵە ناڵی

چاوی وەکوو هەوری خاکەلێوە
ڕێژنەی بە گوڕی دەڕشت لە جێوە

فرمێسکی لە گۆڕی مەم کە باری
ڕەنگا بە مراری* گۆڕی یاری
*مراری = مرواری.

چەندەی دەکشاند لە دڵ هەناسە
تێکڕا ئەوی خزمە یان نەناسە

فریادی بڵند دەبوو بە گریان
کێ بوو دڵی بۆی نەبێ بە بریان ؟

پێشمەرگە و ئەفسەر و وەزیران
درویش و لەپێش و لاو و پیران

دڵدار و جوان و نازەنینان
دارا و هەژار و دڵبرینان

وێکڕا وەکوو زین ـ ێ دەڵبەخەم بوون
ڕۆڕۆ دەگەیشتە چەرخی گەردوون

هاوار و گرین و داد و شینی
بردی گوڕ و هێز و تاو و تینی

ڕۆنیشت لە پەنای سەری مەم ـ ی ژار
دەیگوت بە سەد ئاخ و زاری، ئەی یار

ئەی خێوی دڵ و لەش و گیانم
باخ بووم و ببوویە باخەوانم

لەو ڕۆژەوە باخی خۆت نەدیوە
وشکە، کزە، زەردە، پەل وەریوە

شللێرەیی لێو و پستەیی دەم
بادامی دوو چاو و سێوی کوڵمەم

دوو مەمکی بڕەو شکێنی لیمۆ
بێ ناز و لە هەڵوەرینە بێ تۆ

لێت ڕوون بێ کە نادرێتە دەس کەس
تۆی خاون و تۆ دەناسن و بەس

ئەمبەژنە لە سەر تۆ ڕاوەشێنم
میوە و گوڵ و پەلکی داوەشێنم

شەوبۆن و وەنەوشە و هەڵاڵان
بسک و خەت و خاڵ بدەم بە تاڵان

وەک گوڵ شمەکی دروو دەبەر کەم
بۆ تۆ قوڕ وخۆڵ و گڵ وەسەر کەم

بسکان هەموو تا بە تا بکێشم
وەک گیانی پەژار و پڕ لە ئێشم

ئەم باخی گوڵەم بە ڕێک و پێکی
هەر پەلک و شکۆفە و چڵێکی

بۆ تۆ بوو کە بێی و لێی بنۆڕی
تۆش جێگە دەگۆڕی، جێ لە گۆڕی

من جوانی چ لێدەکەم بە بێ تۆ؟
بۆ تۆ نەبێ با بچێ بە فیڕۆ

ترسم کە نەبا دڵت دەمێنێ
هەر پارچەیەکم دەخستە شوێنێ

جوانیم و منیش کە بووینە ماڵت
کاتێ کە دەمرم و دێمە پاڵت

لێمت دەوێ ڕەنگ و بۆنی جوانیم
چاوی بەڵەک و برۆی کەوانیم

سەر کوڵمە بە سووری، لێو بە ئاڵی
سەرسینە بە نەرمی، مەم بە کاڵی

بسکی ڕەش و بەژنی نەو نەمامم
نەم مابێ دەبێ چ بێ وەرامم ؟

چی لامە دەبێ بگا بە خێوی
نەیگاتێ کەمایەسێ و پەشێوی

بۆ وەی کە لە دیدەتا نەبم سووک
ڕازاومەوە بۆت لە چەشنی نۆ بووک

وەک پێشووە بەژنی شۆخ و شەنگم
سەرخۆشت دەکەم بە بۆن و ڕەنگم

ئامادەیی ماچی تۆن دوو لێوم
تورت و شەقە مەمکی شەکرە سێوم

هەر چۆنی منت دەوێ تەیارم
بمگوێزەوە سازە کار و بارم

گۆڕیچەیی تۆ دەکەینە پەردوو
ترسی نەگەیین بەیەک، بەسەر چوو

هامێزی لە کێلی مەم وەرێنا
ئاخێکی دوای بە ژینی هێنا

گیان هەڵفڕی چوو بە لای خوداوە
لەش کەوتە زەوی و چرای کوژاوە

لەو کۆمەڵی پڕ پەرۆش و ئازار
نویێ بۆوە دووبارە داد و هاوار

تویێژاڵکی برینی کۆنە لاچوون
دیسان لە قوڕی پەژارە ڕاچوون

ژان چۆوە دڵان بە مەرگی زین ـ یێ
گیرایەوە کۆز و کۆڕی شینیێ

وەک جۆ* و پلۆسک* و چەم، هەموو چەم
فرمێسکی وەراندە سەر گڵی مەم
*جۆ = جۆگە، جۆگەلە * .پلوسک = لووساوک ، ئامرازێک بۆ دەرکردنی ئاوڕۆی سەربان.

شۆرایەوە گڵ بە تاوی باران
بارانەیی چاوی خزم و یاران

قاپۆڕە دوڕی کە داخرا بوو
ئەو گۆڕیچە وا مەم ـ ی تیا بوو

سەرپۆشی سەری کە هەڵدراوە
بوخچەی گوڵ و بۆنی خۆش کراوە

زین ـ ی شل و مل خرا تەنیشتی
پێک گەینەوە دوو مەلی بەهیشتی

ئەی مەم! وتی میر :دەبگرە زین ـ ت
وا کردمە یاری هاوسەرینت

پیرۆز بیێ لە تۆ و لە دەزگیرانت
ڕابوردنی خۆشی ئەو جیهانت

لەو گۆڕەوە مەم وەرامی داوە
خۆش هات و جێگای لە بانی چاوە

ئەو ڕازە گرینگە هەر کێ بیستی
زانی چییە نرخی خۆشەویستی

بۆ وانەیە ئافەرین کە وا چوون
دڵتەنگ دەژیان و دڵنیا چوون

خاکاوی نەبوون و چوونە ژێر خاک
دۆڕاندنی بۆ نییە دڵی پاک

ئەو یاری کە پاک و پاک ڕەوشتن
ژیانیان نەمرە و لە ناو بەهەشتن

لێو توونی و کەم لە یەک نەدیوان
ئامادەیە لای خودا بەشی وان

ژیان خۆشە لە گەڵ ئەوین برابێ
گیان خۆشە بە هۆی ئەوین جیا بێ

هەر کەس بە جوانی چەشنی زین ـ ێ
دڵداری بوێت لە باتی ژینێ

یان وێنەیی مەم لە ڕێی ئەوینێ
خۆشی و گەشەیەک لە ژین نەبینێ

سەر دانێ لە ڕێی نیازی پاکا
خوا یاری دەبێ و زیبانێ ناکا

ئەی خوایە بە نازی نازەنینان
بە نیاز و نزای جگەر برینان

ئەی خوایە بە شیرنی جوانی
بەو دڵتەڕی دوور لە کامرانی

خوایه به دڵێ ئەوین دەچێژێ
بەو چاوە سریشکی ئاڵ دەڕێژێ

ئەی خوایه به ناڵه ناڵی بولبول
خوایه به خوناوی ناوی سوورگوڵ

ئەی خوایه به ئاهی لەیلی بێ ڕەنگ
بەو شێتی هەژاری لەیلی دڵتەنگ

ئەی خوایه به ئاهی لێو بەباران
ئەی خوایه به پێک گەیینی یاران

ئەی خوایه لە ڕێی کوڵی دڵی مەم
بەو زین ـ ە کە کەوتە سەر کڵی خەم

بێ بەش لە ئەوین مەهێڵە خانی
ئەو کاتە کە دەردەچێ گیانی

پێغەمبەری خۆش بوێ هەتا سەر
بۆ دوایی نەبێتە داری بێ بەر

بێ کین و، لە دۆستی پڕی کەی
گیان و دڵی فێرە باوەڕی کەی

سەر زارەکی زۆر بە چاو و ڕاوە
خاوێن دەمە، کردەوەی گڵاوە

ئاکاری لە کاری چاک نەبانە
سەرگەرمە بە کاری پێچەوانە

مەیهێڵەوە هێندە بۆ کوڵ و خەم
با بەر بەزەییت کەوێ وەکوو مەم

هەر چەندە نەچۆتە ڕیزی پاکان
بیبەخشە وەکوو بەکر بە چاکان

****

## چقڵی مەم و زینـان

زۆر سەیرە ئەوانە چۆن ژیابوون
دوای کەوتنە ژێر گڵیش وەها بوون

کێ فێری چ بوو لە کاتی ژینا
پیشەی ئەمە بوو لە ژێر زەمینا

لەو گۆڕە کە زین و مەم تیا بوون
تۆمەز بە ئەوینێ ئاو درابوون

ڕسکا بوو دوو نەو نەمامی سەرکەش
ڕاست و شل و شین و ناسک و گەش

تورت و شەق و پڕ گەڵا و بە سێبەر
یەک شەنگە بیی و یەکیش سنۆبەر

ئاڵان بە یەکا ئەمانە چین چین
وەک دەستەملان دەبوون مەم و زین

گڵکۆی بەکر ـ ی چنۆکی بەدکار
دارێکی ڕواند دڕوو چقڵ دار

تێکۆڵ گڕ و پەل پەل و ڕەش و خوار
وەک کووتی بنی لە بەهرە بێ پار

هاویشتی پەلی بەرەو نەمامان
پێچای سەر و بن لە ڕەگ لە دامان

هەر تەنیەوە پێچی دا هەتا سەر
نێوانی تەنین و بوو بە لەمپەر

هێدی نەبوو تا لە یەکدی کردن
چقڵی مەم و زین بە ژین بە مردن

هەر خوویە کە دەیگری بە شیری
ناچێتە دەرێ دەڵێن بە پیری

وا دیارە لە مردنیش دەمێنێ
بەد، خۆی چووە ،خۆی دەنک دەچێنێ

پێوازە سەگانەیەک بکەی شین
سەد ئاوی بدەی بە شیر و هەنگوین

پەروەردە ببێ لە ناو گوڵاوێ
ڕایگوێزە لە سێبەر و لەتاوێ

هەر ڕۆژە لە لایەکی لەتی کە
قەڵشاوی پڕی گەزۆی سپی کە

شەکری لە پەلانی دا بنێژە
دۆشاوی لە سەر گەڵا بڕێژە

پێت وانەبێ بۆت ببێتە شووتی
بەهەرەت ئەوە بۆگەنیو لە لووتی

****

## بەکر دێ دەخەوی پیاوچاکێکەوە

ئاگا لە جیهانی پیر یەکێ پیر
گێڕایەوە بۆم شتێکی دڵگیر

گۆیا هەبوو پیرێ دوورە دنیا
دەژیا لە چیایەکا بە تەنیا

سەرگەرمی هەوای خوداپەرستی
دایگرتبوو بیری خۆشەویستی

خواناسی بەدڵ، نە سەر زمانی
دڵڕوونی ئەوینی ڕاستەقانی

چەوسا بوو لە ڕێگە دا گەلێ ساڵ
تا گیانی لەسەر لەشی ببوو زاڵ

تێکەڵ بە خودا ببوو بە جارێ
بێ ئەو بە کەسی نەمابوو کارێ

خوا، خوا بوو هەموو دڵۆپی خوێنی
دەیزانی گەلێک شتی نهێنی

هەر لێکی بنایە پەلکی چاوان
دەیدی لمی سەر بەژ و پەنایان

جارێک لە نێوانی ڕۆژ و شەو دا
یان نیوە شیار بوو یان لە خەو دا

باڵداری گیانی کەوتە گەشتێ
چوو گەردشی کرد لەناو بەهەشتێ

کۆشکێکی لە زێڕ و گەوهەری دی
زۆرتر لە هەزار کوڕ و پەری دی

پارچە هەمە ڕەنگەیان دەبەر بوون
لەو کۆشکە کەنیز و کارەکەر بوون

وا تاج بەسەرێکی شۆخ لە دەرگا
زۆر قۆز و تەیار لە ڕەنگ و بەرگا

وێستاوە بە هێمنی لە جێوە
ڕوو خۆشە، گەشە و بزەی لە لێوە

ئەی پایەبڵند، وتی: ئەتۆ کێی ؟
ئەو کۆشکە بە کێ دەگا کە تۆی لێی ؟

بەکر۔ م وتی مامی پیری زانا
بەخشیمی بەزەی خودای توانا

ئەو دەم چوو کە بووم دڵ و بەخت ڕەش
لای زین و مەم ـ ێ کراومە هاوبەش

ئەم کۆشکە دەبینی هەشت نهۆمە
هی وانە حەوت، یەکێک هی خۆمە

لێرەش ئەوە چاوەدێری وانم
پیشەم وەکی پێشە، دەرکەوانم

زۆر بەختەوەرم گەلێ بەنازم
دۆستییانم و پاسەوانی ڕازم

لام وایه که لێره ڕادمێنی
لەو بارەوە دوو دڵی دەچێنی

ژین تاڵکەری زین و دوژمنی مەم
چۆن ڕۆنەبرێت لەناو جەحەندەم ؟

ئاگات له جیهان هەیه نه لێره
جێم ئێرەیه، گوێ له من بدێره

هەرچەنده به دڵ بەوان نەیار بووم
ماکەی گەڕ و بەدفەڕی و گەمار بووم

ئەم هێشت که به یەک بگەن به خۆشی
هەر یەک له دەسم زووخاوی نۆشی

خۆم کرده چوقڵ له بەینی وانا
خۆشم له سەر ئەو شتانه دانا

بڕوانی بەڵام به چاوی دووربین
ئەم تاڵییه دای بەرێکی شیرین

کێ زۆر له جیهان ژییانی خۆشه
زۆر وایه که لێره دڵ پەرۆشه

کێ ڕەنجدەر و دڵ به دەرد و ئێشه
دوای کۆچی دووایی زۆر له پێشه

بۆ ئێره و ئەوێ وەکی هەوێ یه
وەک دوژمنی سەختی خوێنه خوێیه

تا تۆ له یەکێکی چاو نەپۆشی
بۆ ویدی بکۆشی بابه کۆشی

لای وانییه هیچ به بیر و ژیریٚ
دوو شووتی به دەستیٚ هەڵدەگیریٚ

من زین و مەم ـ م له سەر زەمینیٚ
تووش کرد به پەژاره و گرینیٚ

کێشامنه بەریٚ به داخ و دەردان
دەستم له جیهانی ئێوه بەردان

ئەو چەرمەسەرەم که داوه پێیان
وا ئێسته دەبینی چۆنه جێیان

هۆی من بوو درا بەوان بەهەشتێک
دایانمیٚ ئەویش له هەشتیٚ مشتێک

تاژدین ؟ وتی: چۆن دەبیٚ که تۆی کوشت؟
چی دێتەوه ڕیٚ که خوێنی تۆی ڕشت ؟

پێی گوت که خودا لەویش دەبووریٚ
بەخشینی کڕی به قەڵتی شووریٚ

بۆتان که وەڕەز ببوو له دەستم
خستم هەچی دەبوه بەر هەڵستم

وەک مار، ئەوی هاته پێشیٚ گەزتم
ڕزگار نەدەبوون له بەند و بەستم

وەک دەردی گران له گەڵ پەیا بووم
وەک کونده بەبوو ژیام هەیا چووم

ئەو دەستی که ئەو له من وەشاندی
هەر دەردیٚ له دڵ هەبوو پەڕاندی

ئاسوودە کران هەژار لە چەنگم
دەرچوون دڵی تەنگ لە چاوی نەنگم

گیرا بوو لە بۆی نزای هەژاران
نووسراوە ئەویش لە چاکەکاران

کار هەن بە ڕواڵە نالەبارن
دەیکۆڵییەوە زۆری بەهرەدارن

خوا ڕازی گرنگی خۆی بە هاسان
ناداتە نیشانی خۆ نەناسان

بڕوانە دەبەخشێ بەکر و تاژدین
دووی دوژمن و دۆست لەبەر مەم و زین

ئەم ڕازە گەلێک نهێن و کوورە *
بیری من و تۆ لەوانە دوورە ؟!!
*کوور = قووڵ.

هەر چۆنی ببی نزیکی باشان
هەر باشییە دێتە ڕێت لە پاشان

گەر یاری بە دڵ، لە ڕێت دەکۆشن
پێت شادن و ، کز بی بۆت پەرۆشن

گەر دوژمنی، ئەو لە کینە دوورن
لە گوناە و هەڵەی نەزان دەبوورن

ناکەس نەچی هەر نەبی تخوونی
گەر یار و نەیاری سەرنخوونی

مرداره لەشت کە سەگ پەرستی
گەر دوژمنی، ڕاکە قاچی گەزتی

دڵداری گەلێ بڵند و بەرزە
گەر دوور بێ لە کاری پیس و هەرزە

هەر کەس کە دەبێ نزیک ئەوینێ
هەر چۆن بێ بەزەی خودا دەبینێ

بەخشینی خودا بە دوور مەزانە
هەر بەندە برێک لەسەر بەهانە

نەخوازە لەگەڵ هەژاری دڵدار
هەر خۆی کەسی بێکەسە و بزی کار

لەم شیوە بە سەربری مەبوورە
باش ورد بەرەوە، تێبگە چ جوورە

دوژمن بە ئەوینێ بەهرەوەر بن
دۆستان دەبێ چەندە بەختەوەر بن!

تاژدین ـ ێ دەبەخشێ، یاری یارە
بەدکارییە بۆ بەکر بەکارە

دڵدارییەکی پاک بکە بە پیشە
هانات بەرە بەر خودا هەمیشە

****

## چی نووسیوه و بۆچی نووسیوه؟

ئەی گوێگری ژیر و زیت و پیتۆڵ
پسپۆری وتەی بە نرخ و کرمۆڵ

خانی لە مەیی ئەوینێ مەستە
بێهۆشە وتار پەڕێنە پەستە

سوێراوێ بە شیرنی دەچێژێ
سەرخۆش بووە هاتەران دەبێژێ

نازانی کە تیرە* یان تراوە*
دێوانەیی بادە بیر بڵاوە
*تیر = خەست. * تراو = ئاوەکی ، ڕوون، دژی خەست.

هەرچێکی کە پێت دەڵێ هەوایە
وەک دەنگی نەیێکە دەنگی نایە

بێ جێ نییە خۆشە دەنگی بلوێر
گەر شۆڕێ بخاتە سینگی گوێدێر

لەم نامەیە دا بە چەشنی منداڵ
چۆن تازە دەکەونە سەر گڕ و گاڵ

هەرچێکی دەسم کەوت مت و موور
بۆر و کەوە، زەرد و ڕەش ، سپی و سوور

هێندێکی چرووکە ، هێندێ چیرۆک
هێندێ شڕ و ڕووتە ، دەستەیەک کۆک

زاراوەیی (بۆتی)یان و گۆران
وێژەی موکری و لۆران و سۆران

کۆم کردەوە گش درشت و وردی
هۆنیومە بە بەند و باوی کوردی

پووچیشی هەیە و پڕ و بە کاکڵ
بێ جێشی هەیە و شتی لەبەر دڵ

بڕوامە گەلێکی دڵپەسندن
بڕوانە دەزانی زۆری پەندن

ئاواتی دڵم چ بوو لەمانە؟
دەرخستنی ڕازی دڵتەڕانە

جوانتر لە هەموو شتێک ئەوینە
دڵداری بەهەشتە، بینە، ژینە

گیانێ کە ئەوینی بۆتە مایە
وەک ئاوێنەیە و خودا نومایە

وەک ڕۆژە ئەوین بە تیشکە، ڕوونە
خاوێنکەرەوەی دڵ و دەروونە

هەر ڕێڕەوێ ڕووی دە لای خودا بێ
با بێ و بە ئەوینێ شارەزا بێ

گیان و دڵی سەخت و ڕەش لە ئاسن
ئاوێنە دەبن ئەوین بناسن

تۆزێ لە ئەوین بەسەر مسا* کە
پاش تۆزێ بنۆڕە، زێڕی پاکە
*بە سەر مسا کە = بەسەر (مس)ی دا بکە .مس = کانزایەکی زەردە.

هەر دڵ کە ئەوین بکا بە پیشەی
دڵداری بکا بە پنج و ڕیشەی

گەنجینەیی ڕازی بێ نیازە
کارسازی لە لایە کاری سازە

هیچ کەس نییە بێبەشی ئەوینێ
کەمتر هەیە زۆر بە کەم نەبینێ

دوو تیرەیە چی لە ڕووی زەمینە
یەک چاوی لە ژینە، یەک لە دینە

یەک چاو دەبڕێتە سەر کچۆڵان
بازاڕی ندیوە چۆتە چۆڵان

ئەو گەوهەری دڵ دەدا بە ماچێ
پێی وایە بە هیچی دیکە ناچێ

خۆڕایی لە دەستی دەر دەهێنن
کۆشکێکی بە پووشکە لێ دەسێنن

ئیدیش بە هەوا بەهەشتێ دەکڕێ
فیزێکی دەگاتێ دەستی دەبڕێ

خوا لای وی، لە کوڵکە بۆتە چەرچی
دەیداتێ بەهەشت بە ڕیش و پرچی

جا هەر کە لەوانە یان لەمانە
بێ ڕێبەرە، کوێرە، ڕێ نەزانە

لە ژیانێ دەکەونەوە و، کە چووشن
بێچارە بە جارێ دەم لە پووشن

****

## وردەکارییەکی دەروێشانە

مەیگێڕ بدە پێم مەیێکی کۆنە
پێشم بڵێ ئەم جیهانە چۆنە

ئەم ڕایەڵ و پۆ و چنین و تەونە
پێت وانەبێ هیچ و پووچ و خەونە

ژینمان لە بەرا سەرێکی بەرگە
لە دوایە نەمانە، گۆڕە، مەرگە

هەر مانێ کە دێتە بەر نەمانە
ڕیشەی دڵی خۆش لەسەر خەمانە

ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ لە بەرزی
دەسمایەیی ژین و بوون لە عەرزی

هێندێکی گران و هێندێ سووکە
هێندێکی درشتە، هێندێ چووکە

دەزگایەکی جوانە ڕێک و پێکە
داخم کە نەمر نییە و سەرێکە

عاسمانی بە ڕۆشنی و زەوی شین
وەک ڕێکی دەخەن کەرەستە بۆ ژین

وەک مایەیی ژینی خۆش ئەمانن
دیسانە ئەون کە هۆی نەمانن

ئاگر وەکووژێ، هەوا هەوایە
گەر ئاو نەبێ تۆزی خۆڵ بە بایە

عاسمان که گەڕۆکه ئاش دەگێڕێ
هەر لاش و سەری مرۆ دەهێڕێ

نێژراوی لەبن گڵا که مردوون
تۆزاشی* ئەوه که وردی کردوون
*تۆزاش = تۆز+ئاش : تۆزی ئاشی.

هەر لاش و سەرن دەوێوه دەڕژن
هەر کەوتنه بەر بڵاو و پڕژن

ئەم جاره دەشێلدرێن، هەویرن
لای ئاگره گشتی یەکدی گیرن

تووش بوونه به دەردی داتوڵیوی
هەر مانەوەیه به بۆگەنیوی

فەرموویه خودا: که دەچنه ئاور
نەمر و نەژییه ژییانی گاور

ئەو گیانێ که پاک و پاک سروشتن
خاوێن به هەوێن و چاک ڕەوشتن

جووتبەنده بەتاییەتی هەڵێنێ
ئەو دەنکه به ناو و داو دەچێنێ

دەڕزێت و بڵاو دەبێ له بن گڵ
لێی دەر دەکەون پەل و گەڵا و چڵ

بەر دەگرێ هەزار ئەوەندی پێشوو
گێرەی دەکەن و دەبێ به تێشوو

بێژینگه ژیان، جیهان وەکوو کەو *
تل پێ دەدرێ له گێژی گێژەو
*کەو = سەرەند ، ئامرازێکه دەغڵ و دانی پێ دادەبێژن .

بەرداشی خلێنە و ددانان
لیکی دەم و چەق چەقی زمانان

بانیژەیە لێو، زارە ئاشە
هەر چەرخ و خولێک و ورد و خاشە

ڕزگار بوو کە لەم گەڕ و گەزەش دا
دابەش دەکرێ بە هێزی لەش دا

گا، کێشەری ژووریَ ڕادەکێشێ
گا، گێرەیێ دیکوشێت و دێشێ

جارێکی لە قوت دەرێکی بەندە
جارێ بە هەڵێنەری بڵندە

تەندووری ورگ ئەوی دەپێژێ
هەرچی خت و خاڵە لێی دەڕێژێ

خاوێنی هەموو دەچێ بەرەو ژوور
پیسایی درێژێنە جێیەکی دوور

کێهەی گەلێ باشە با جیا بن
هەر نابێ ئەویش لە گەڵ یەکا بن

دابەشکەری سارد و گەرمی ناو لەش
چی بۆچی دەبێ لەوێ دەدا بەش

ڕەنگڕێژی لە شان بەمانە چەند جوور
هەندامێ وەڕەنگ دەخا دەر و ژوور

دڵ شووشەیە، جەرگە بۆتە پاڵوێن
ڕوون بێتەوە خەستە بادەیی خوێن

هیچ پووش و پەڵاشی تێ نەچووبێ
نابێ بە گرێ و گلوو گلوو بێ

هێشتا دەیەوێ هەتا دەگاتێ
بتکێتەوە تاوێ بوکڵی کاتێ

جارێکی بڵق بدا لە ئاوا
جارێ بهەژێندرێ لە ناوا

هێزی لە گییان دەبێ بسێنێ
تا گیان هەیە وا ئەویش دەمێنێ

بێدەنگە هەتا لە ماڵی لەش دا
ئاواتی نەهاتە جێ لە مەش دا

گەر بەو لەشەوە خرایە بن گڵ
دووبارە بە شینی دێتە سەر چڵ

بارانی بەزەی خودا بباری
ئەو سەوزە دەبێ بە شەنگە داری

پەلک و گوڵی لێ دەبن بە سەرپۆش
بەر دەگرێ بە میوەیی تەڕ و خۆش

ئەو میوە کە باش بگا لە پاشا
بۆ دیاری دەچێتە ماڵی پاشا

گەر بیچنێ دەستی پاکی پاکێ
دووری خەنەوە لە تۆز و خاکێ

جێ بدرێ لە بارەگا دروستە
میوێکی بەناز و خۆشەویستە

ئەم جۆرە بە نرخن و نەیابن
کەم هەڵدەکەون شتێکی وا بن

چی کاڵە لە بەر هەوا دەمێنێ
پێویستە کە گەرمی بیگەیێنێ

باشتر دەگەهن هەیا پتر مان
چاوێری کرین لە مێش و کرمان

پەروەردە کرێن بە تیشکی دینێ
وێیان کەوێ تاوی خۆ نەبینێ

ئەوسا ئەوی زۆر پوخت گەیشتن
وا دا دەوەرن ئەگەر درشتن

تا دانەکەون لە پۆپی بەرزی
تا دانەنەوێنە ڕێکی عەرزی

تا دانەتەکێن لە فیز و مینگە
ڕێیان نییە بچنە سەر گوشینگە

زۆر پان و فلْچ دەبن لە ڕێدا
دەفلیقنەوە لە ژێری پێ دا

ڕێک لێکی دەدەن سەر و بەر و ناو
خوێناوی دلآن دەبێتە خۆشاو

ئەو میوە ئەگەر ڕەگێکی کاڵە
خۆشاوەکە، تفتە، ترشە، تاڵە

نیشان دەدرێ بە پیری مەیخۆر
پێویستە کە خۆی بدا هەل و نۆر

ئەمجار دەکرێتە ناو بەرۆشێ *
گەرمایی دەوێ هەتا دەجۆشێ
*بەڕۆش = مەنجەڵ ، قازان.

تیشکی بەزەیی خودای بگاتێ
تینی لە شکۆهی خۆی بداتێ

پوختایی بەسەر یەکا بتاوێ
ماک و ڕەگەزی لە ناو دەراوێ

ئەو تینە گەلێک بەهێز و توند بێ
بوکلێندرێ هەڵمی لێ بڵند بێ

ئەو هەڵمە ببێ لە چڵکنی دوور
بێ تۆز و هەوا بچێ بەرەو ژوور

لەو ژوورە پلێکە ناوی ڕووت بوون
دەتکێنێ لەوێ دڵۆپی دڵ ڕوون

گەر ماک و ڕەگەز هەموو تواوە
بەو بۆنە بەشی لە بۆن بڕاوە

جێ دەشێ نەبوونی دڵگوشایە
نامێنێ لەوێش هەتا هەتایە

دیسانەوە جێی لە دەفری تەنگە
ئەمجارە لەوێ نە بۆ نە ڕەنگە

ئەو مەی کە بە ڕەنگی سوور و ئاڵە
ڕەنگێکی دەداتە ناو پیاڵە

ئەو هێشتە نەکەیوەتە گەیشتن
ڕزگار نەبووە لە ترسی ڕشتن

تا بۆنی لە بۆن و مانی مابێ
بۆ کۆڕی خودا نموودی نابێ

تا ڕەنگی هەیە نەبۆتە بادە
چەوسانی بە هیچە ڕەنج بە بادە

مانت گەرەکە ؟ بەری نەمانە
ماو ئەو کەسەیە لە خۆی نەبانە

تا ماوە لە بەندە دا وشەی «من»
بێ دۆستە لە خۆی دەبێ بە دوژمن

دڵداری دەگاتە بارەگای یار
دەرچووبێ لە وەندە قۆرتی دژوار

ئەم ڕێگەیە سەختە بۆ مە نابێ
ڕێبەر لە بەرێ مەگین خودا بێ

ئەی خوایە دەزانی ئێمە کوێرین!
تۆ بەرزیی و ئێمە چاو لە ژێرین

دەریای بەزەییت دەدا شەپۆلان
سەرگەرمی مەلەم لە کوێرە گۆلان

چاوساغی بەزییەکەت بنێرە
تاریکە شەوم چرا بدێرە

تەم با بڕەوێ لەسەر دڵی ژار
بینام کەرەوە بە شەوقی دیدار

ناسینێ کە بۆمە بۆتە یاسا
هەر دوو دڵییە و گومان و لاسا

دڵمان بخە دەر لە بەدگومانی
شانمان دە* ئەوینی ڕاستەقانی
*شانمان دە = نیشانمان بدە.

باوەڕ هەیە لام و تۆش دەناسم
لەو پێوە کەساس و گێژ و کاسم

زۆر دڵ بە نیازی بارەگاتم
چبکەم نە بەخۆمە دەستەڵاتم

گرتووتم و خۆت کلیل بە دەستی
ڕێگەم بدە بێمە تۆ پەرستی

ئەم ژین و نەمانە لەم جیهانە
هەر چەندی کە ئاشکرا و نیهانە

تاپۆیە لە تۆ بە تان و پۆیە
تاریکی و ڕۆشنی لە تۆیە

چاوت نە لە کاری چاکە یان چەوت
بەخشین بە بەهانەیە و بە ڕێکەوت

زۆر نوێژکەری پاکی ڕێی خوداگر
ڕوو بینییەکی کرد و کەوتە ئاگر

زۆری بە گوناه لە کاتی مەرگا
دەیبەخشیی و ڕێی دەدەی لە دەرگا

گەر بەختەوەر و، کە ڕەنجەڕۆیە
سەر ڕشتە هەمووی بە دەستی تۆیە

هەر ڕۆژی بەرێ هەڵت بژاردن
چی بۆچی دەبوو بەوت سپاردن

پاڵ پێوەنەریشی و لەمپەریشی
گومڕاکەر و ڕێ نیشاندەریشی

سەرپشکییەکەت کە داوە پێمان
ئەو نەوسی چنۆک ڕفاندی لێمان

ماوین و بەزەی خودا ببێ یار
هەر هێندەیە چارە بۆ گوناهکار

بڕوای بە خودا ببێ و بەسی بێ
هەرچەندە فرەش کەمایەسی بێ

با بیشی پەرستێ لێی بترسێ
ڕێ و شوێنی لە پیاوی ژیر بپرسێ

ئەو ڕێی کە دوێژنە ئێمە بگرین
خۆمان نەگرین هەیاکە دەمرین

چاومان لە بەزەی خودا بدوورین
ئەومان بێ لە ئاگرێ بە دوورین

****

بەرەو موکوریان

شەوە تاریکە کش و ماتە زەوی
کەوتە خەو کێوی، کەوی دار و دەوی
تووتەک و گوێن و کوند وشیارن
ڕۆژ وچانیانە بە شەو پڕ کارن
لەو هەموو جانەوەرەی وەردەکەوێ
نازەنینیش هەیە لای لایێی دەوێ
شنەبای وردە گوڵاو دەپڕژێنێ
پێی سپێراوە گەڵا ڕاژێنێ
خوڕ خوڕی ئاوە لە بەفری سەر کەل
خۆش هەوای تێکەڵە زەنگی سەر کەل
سەگ بە دەم پرخەوە دەم دەم دەمڕێ
لە خەوا دیویە گورگ بەرخ دەدڕێ
بۆق لەسەر نوێنی قوڕین قیڕەی دێ
سیسرە ژێی تاری شڕە و سیڕەی دێ
جار و بارەش کەڵەشێر دەخوێنێ
بانگ لە ئەستێرە دەکا بێدوێنێ
ئاگری شوان دەگڕێ لەو دوورە
بووکی خێوی شەوە ، تارای سوورە
گەشن ئەستێرە چ بەرزن، چ نەوین
گشتی پێت وایە ئەویداری زەوین
زۆر بە پارێزەوە هەست ڕادەگرن
بە هومێدێکەوە چاو دادەگرن
****
مانگ ئەوا تازە لە ئاسۆ دەردێ
کۆمەڵێ هەورە سپیلکەی بەردێ
وەک مناڵی کزی باب ئاوارە
چاوەڕێ بوون وەگەڕێ دووبارە
وا ڕەوی مژ لەبەر ئەو پێوارە
گەش و ڕوون بوونەوە بەو دیدارە
بە لەز و هەڵپە هەموو زۆر بە دەون

هێندێ پێشڕەون و بڕێ دوا دەکەون
گش بەرەو پیری دەچن زووی بگەنێ
مانگ لە خۆشیان دەگری و پێش دەکەنێ
دیمەنی ڕوون و جگەر سووتاوە
ئاگری دووری بە تین و تاوە
یەک یەکی گرتنە هامێز ڕووخۆش
هەورییە هەور و لە ڕوویا ڕووپۆش
پاش گەلێ ماچ و لە باوەش کردن
تیشکی زێوینی لەسەر بەش کردن
چاك و خۆشی دەگەڵ ئەستێران کرد
کەوتە خۆ و بووکی زەوینی جوان کرد
ئاوی کانیاوێ کە وێنە نوێنە
دڵی خۆی داوەتێ دڵ بزوێنە

****

شەوەکی بوولبولە دەچریکێنێ
تا بە لاوک دڵی گوڵ بستێنێ
دە ئەتۆش هەستە خەیاڵی خاوم
من ئەگەر تۆم نەبێ، زۆر داماوم!
لەم هەژارخانەیە بمهێنە دەرێ
بمبە دەشت و دەرێ بمگێڕە سەرێ
دەست و بردێ شنەبام بۆ زین کە
جێم دەگەڵ خۆت لە هەیڤ دابین کە
سەیری خاکی موکوریم دێ بە دڵا
تا نەچووین خۆم و دڵ و تۆش بە گڵا
سەرێ هەڵبێنمەوە لەو مەڵبەندە
گەرچی لەش دوورە لەوێ دڵ بەندە
***

لاجان

دەشتی لاجانێ بەهەشتی پێشووم
هونەرم گەر هەبێ، لەو ڕا تێشووم
ئێرە بوو لانکی یەکەم دڵداریم
لێرە هەڵبوو سەرەتای خەمباریم

چاوی کارمامزێ خستیمیە کەمەند
نازی پێدام و دڵ و هۆشمی سەند
هێندە فرمێسکە لەوێ ڕشتوومە
هێندێ لەو ڕازە لەوێ ناشتوومە
بێتەدەر، گۆلە لە خوێناو پڕ خوێ
بێتە بەر، دڕک و گوڵی لێ دەڕوێ!
چاوی من بوو بە درێژیی شەوگار
ملەبارانی دەگەڵ هەوری بەهار
ڕادەمان دیدەکەم و ئەستێرە
کامی زۆرتر بە خەوی کەم فێرە
من و پەروانە دەمانکردە گرەو
کێ لە سووتان بەگڕە؟ من یا ئەو
گڕ و یار کێیە لە کێ جوان چاکتر
شۆقی یار دەردەکەوت ڕووناکتر
ژینی شادیم لە ژوانگەی نێژرا
بە بژانگم گڵەکەی دابێژرا
بۆ بزەی لێو تەمەنی لاویم گوشت
بۆ ڕوانین ، بە زووخاو چاوم ڕشت
نرخی ماچێکی دڵ و دینم دا
ئەمە چەرخێ بە هەموو ژینم دا
گەرچی نازدار و هەژار ڕێک نەدەهات
مەخمەر و کۆنە دەوار لێک نەدەهات
ئەوی من پێم گەیی دیسان زۆرە
بەخششی دەستی ئەوین چەند جۆرە
تووشی دەردی دڵی دڵداران بووم
شیاوی ناو کۆمەڵی خەمباران بووم
چاوی هەر سوورم و ڕەنگی زەردم
دڵی وا گەرم و هەناسەی سەردم
بیری سەرشێت و سەری شێواوم
چم نەبوو، پاکی ئەوین پێی داوم
گەنج و سامانی هەژاریم کە هەیە
سوودی سەودای سەری ئەو سەردەمەیە
شەوەکەی کورتە دەبا واز بێنین

دڵی هار چیدی نەهارووژێنین
***

ماسوو * ( ماسوێ(

ماسوو، ئەو کێوە هەوارگەی دڵ بوو
جوانێ لەو نێوە گوڵی سەرچڵ بوو
لێک دەهاڵاین دەسەمل شەوگاران
ئەو بە ناز ، من بە نزای دڵداران
***

قازیاوێ) * قازیاوا(

چۆمی قازیاوێ لە خێڵی خاڵان
شڵەژاندوومی دەگەڵ منداڵان
خانووە ڕەملێنە لەلام خۆش بوو، بەڵام
لێم دەڕووخایەوە ، ئێستەش هەروام
***

پردی سوور*
پردی سوور ئاخۆ لەبیرت ماوم
بە نەمامی لە دەراوت ڕواوم!
سەردەمێک ڕێڕەوی دڵداران بووی
سەر لە ئێوارە مەکۆی یاران بووی
هەینوان جەژنە بوو دەور و بەری تۆ
بەزم و خۆشی بوو لە سایەی سەری تۆ
بەند و بەستێ هەیە بت بزوێنێ*
بشکێ ئەو دەستە دڵت دەشکێنێ
***
ئەوبەری گرد
گرەبەردێ هەیە لەوبەر گردە
ڕوو بە کوردایەتی بۆ من پردە

دوور لە چاوی چەتە، کوردیم دێنا
لێرە دەم خوێندەوە، خۆم ڕاهێنا
***

باغی مکایل*
پێم بڵێ باغی مکایل. چۆنی ؟
هەروەکو پێشوو بە ڕەنگ و بۆنی ؟
دیمەنی سەوزە گیا و دارانت
چۆنە؟ چۆن ماوی دەگەڵ یارانت ؟
ئێستەکەش بۆ گەپ و بەزم و ئاهەنگ
دێنە لات کیژ و کوڕی شۆخ و شەنگ؟
لاوی دڵبەند و بە دڵ دڵتەڕ و ساز
کیژی پشتێند شل و چاو باز و بەناز
دڵ و لێو چەسپی یەک و دەس لە ملن ؟
دێنە باوەشت و بەسەرتا دەتلن ؟
دێتە گوێت ماچ و چپەی ئۆخەی و گیان ؟
بۆت دەڵێ "ماملێ" ڕۆژان و شەوان*
یان قوڵەی شینی توڵەی تارانی
دای گەمارۆت و نەوەك جارانی
باغی ئەوبەر بە بەر و فێنکی دڵن
یان لە بێگانە دژ و دڵ بە کوڵن ؟
***

داری خەزایی*
دارە تووی بەژنی خەزایی ماوی ؟
هەر گەش و دڵتەڕی، یان ژاکاوی؟
بە بەر و سێبەری ؟ کێ دێتە سوێت؟
کوردی خۆماڵییە میوانی نوێت؟
چاوەکەی تۆی دەنواند هەر ماوە
هەر وەکو چاوی هەتیو پڕ ئاوە ؟
***

گڕاو*

مەڵێ سوێراوە گڕاو جێ نزمە
بۆرە خزمێکی دوو چاوی کزمە
بەر لە خۆی کۆوە دەکا پێم وایە
شۆڕشی گەرمی لە بن سەر دایە
***

تاقە دار*
تاقەدار هەر بژی داری چاکی
بە ڕەگ و دڵ پتەوی بێ باکی
زۆر بە میوان و لە کەس ناپرسی
وەکوو بێکەس لە تەرەس ناترسی
جار و بار بێژە بە مەحمەدکانێ
گۆڕە سەرباز هەیە سمکۆ کوانێ ؟
***

شاری مەهاباد
دڵە وا شاری مەهابادە وەرە
کابەتە، ڕووگەتە، کڕنووشی بەرە
تۆزێ لەو خاکە بە سەر خۆتا کە
تۆزی نایابە لە دنیا تاکە
تۆزی چاوی دڵی نابینایە
لێرە کل بوو کلەکەی سینایە
لە چ جێ ناوی مەهاباد بێنی
بۆ هەموو چاوێ بەرز دەنوێنی
***

شاری ئازایان
هەر هەبی، شاری نەبەردی و مەردی
جوانترین پارچە بەسەشتی هەردی
ڕەوەز و لانی پڵنگ و شێران
جێی بە خوێن ڕژتنی خوێن مژ فێران
باوەشی گەرمی بداغ سوڵتانی*

لێرەوە تێپەڕی غەوسی سانی*
گیانی خۆی داوە بە تۆ شێخ بابا
باوی شادی بوو ئەگەر ئەو مابا
لە پەنات ورگی مەلیک زادە دڕا*
ئاگری مەرگی عەجەم لێرە گڕا
گوللە سێ تیری تفەنگی سمکۆ
کەللە سەربازی لە تۆ کردن کۆ
کۆمەڵی ژینەوە، ڕۆڵەی تۆ بوو*
بوونی بۆ ساندن و تۆڵەی تۆ بوو
هەر لە زوو ڕا بە هەوای لای لایی
پێت نیشان داوە ڕچەی ئازایی
ڕەگ و خوێن ، هێزی دڵ و ئەژنۆی بووی
خەو پەڕێن و دنەدەر هەر تۆ بووی
کیژ و لاوانی بەخێوت کردن
کێ دەزانێ چییە ترسی مردن!
ئەو کچەی خشڵی سەری پەلکی گوڵن
گرژی ڕووی دوژمن و ئاگر لە دڵن
ڕۆژی خۆشی کە بزەی دەم چەمەنن
ڕۆژی مەیدان بە مەرگ پێدەکەنن
کوڕەکان هەر وەکو دیمەن تەرزن
لای نەترسان یەکەمین سەربەرزن
***

هەرای (ژ . ك(
ڕاپەڕێ کۆمەڵی «ژی ، کاف « کردی
چەپەڵی دیلی لە داوێن شوردی
باغەکەت پڕ لە نەمامی بەر هات
کاتی خوێن ڕشتن و دانی سەر هات
تا لە سەرتا بلەرێ ئاڵاکەت
پاڵەوان بوونە فیدای باڵاکەت
***

ورە بەرنەدان

دوژمنت گەرچی بە زۆری و گزە بوو
دۆستە بێگانەکەش ئەو دەم قزە بوو
ناهومێدی کوڕی کورد ناناسێ
باش دەزانێ کە لە خوێنمژ ڕاسێ
خوێن ڕژا، ڕۆڵە کوژا، کەللە پژا
خوێن ڕژان خۆشە کە ئابڕوو نەڕژا
ناوی بەرزت لە سەرووی بەرزان بوو
بۆ گورگ لاشە عەجەم هەرزان بوو
***

خۆ بەخشین
گەرچی کەوتیتەوە بەر چنگوڕی دەڵ
گەرچی هێندێک لە چەمت بوونە چەقەڵ*
زۆر کوڕی وات هەبوو خۆیان بەخشی
خوێنی گەشیان گڵی تۆی پێ نەخشی
گۆڕی پیرۆزی حوسێن و قازی
باشترین بەڵگەیە بۆ شانازی
***

دڵدانەوە
نەچی دڵمەند بی لەوەی هاتە سەرت
زۆر کەسی وات هەیە بمرن لە بەرت
دوژمنت پێی وەنەبێ بۆی دەلوێ
کوڕە کورد خەنجەرەکەت بۆ دەسوێ
ئاو نییە خوێنی شەهیدان نەوتە
هەڵ دەبێ و هەل لە ژیان هەڵکەوتە
لاشی لاوانی وەبن گڵ کەوتن
وان لە لای ئێمە لەناو دڵ خەوتن
هەر بینا شۆڕشەکەت هاتەوە گەڕ
سەرنەوی بوو عەجەمی پاشەڵ تەڕ
خەنجەرم چەرمی لەبەر داماڵێ
خوێنی خۆی لاش و سەری ڕاماڵێ
وا بەگیر دێتەوە ڕێی نابێ هەڵێ

مەمکوژە و هەرچی دەکەی بیکە، دەڵێ
وا تەمێ دەکرێ لە فێرگەی شۆرش
تاوی دا و بچتەوە گۆڕی کۆرش
کوردەواری لە دەمی بێگانە
شیرە تریاک نییە وەك سندانە
ئەوی لای وایە ئەتۆی پێ دەخوردێ
دەبێ تاڵاوی بەدەم دا بکرێ
***
خۆشی دوا ڕۆژ
با بەخوێن لاچێ پەڵەی دەس پیسان
دەشەکێ لەو سەرە ئاڵا دیسان
لاوە کوردت هەیە ئاڵا هەڵ کا
لاوەیی ناشێ دەسی تێکەڵ کا
دەڕەوێ تۆز و تەمی ژێر دەستی
دەیگرین ڕەشبەڵەکی بەربەستی
پیس و چاو شۆڕ سەری پێ شۆڕ دەکرێ
گوڕی داگیرکەری پێ گۆڕ دەکرێ
لاوی ئازا و کوڕ و مەرد و ڕەندت
زۆر کچی گوڵبەدەم و لێو قەندت
شان بە شان دەس لە دەسا گۆوەندە
ڕێکی یەک دێنەوە شەندە و مەندە
پێ، کە دەیدەن بە زەوی بوولەرزە
زەردە لیمۆ دەلەرن لەو بەرزە
گۆڕە سەگ ئەو دەمە وا دا دەتەپن
تا زەوی زەوییە ئیتر لێت نە حەپن
***
خۆم چۆنم
من بەبێ تۆ کە دەپرسی چۆنم!
لە تەشەن دایە برینی کۆنم
دوور لە باڵات لە ژیانم زیزم
سیس و بابردە گەڵای پاییزم
چاوەکانم کە لە چاوگەت دوورن
وەك سەری کوڵمی کچانت سوورن

ڕەنگی خاڵ و کەزێیان جەرگی ڕەشم
وەك کەمەریان کز و باریکە لەشم
ڕەنگ و ڕووم زەردە نە وەک گەردنی زەرد
زەردی بێگەردییە ئەم ، ئەو هی دەرد
لەش بەبار ، تۆزێ ژیانم پێوە
لە لکە و وەک لکە باری لێوم*
نە شەوە شەوم و نە ڕۆژم ڕۆژە
داخ لە دڵ بوومە گرێی بەرکۆژە*

---

*گیانم لەسەر لکە و لە کەوتن و وەرین نێزیکە و وەك پەڵەیەکە بەسەر لێومەوە، وا دەزانن بارە لەسەر لێوم نیشتووە.
*وەك دوگمەی سەر سنگ و یەخەم کە لە سنگ نێزیکە و نایبینی و زۆر بەداخەوەیە و جەرگی کون کونە.
***

تۆ چۆن ماوی!
چۆنی تۆ؟ چۆنە دەر و کۆلانت ؟
دیمەنی بەرز و خڕ و خۆلانت ؟
هەموو لا کۆنە گراوی خۆمن
مەمی بێچارەم و زینن بۆ من
سروەکەی قۆرغێ شنەی بێگەردە ؟
وەك هەناسەی منە بۆ تۆ! سەردە؟
گەڕەکی شوان، دڵی هەر وا گەرمە
چاو ڕەقی هەر هەیە، یان چاو نەرمە
ئاوی گەرماوی شوجاع هەر شۆرە؟
شەوی جێژنان هەیە سەر لەنگۆرە؟*
دیاری شایانە کە بدرێ پێشکێش؟
تور و کاهوو، کەلەمی شادەروێش
ڕزگەیی یادێ لە ئاوارە دەکا؟
مەولەوی دەردی دڵان چارە دەکا؟
نوێژگەیەکیش هەیە لەو دەور و بەرە
باغ و بێستانی مەلای سەلکە کەرە
ماڵەکەم یادی جوانی خێر بێ
هەر کەسێ ئەمنی لە تۆ کرد، کوێر بێ

سێبەری باو لە سەرم بوو ئەودەم
باغی شادی لە بەرم بوو، ئەو دەم
دوور خرام وا لە کەس و خوشک و برام
گێژی تاریکە شەوم، دوورە چرام
خاڵە سوورەت چ دەکا؟ هەر چاکە؟
یا خۆ داکەوتووە ڕێکی خاکە
خانەقای نەهری بە خوێن ڕەنگاوە
ڕێی شەهیدان بووە، بەڵگەی ماوە
گوێم لە شێخ قادرە بانگ ئاوازی
بۆ گەلی کوردە بە سەد شانازی
بەر بە سێدارە دڵت ڕانەچەنێ
بۆ وتەن بمرە ژیانت دەدەنێ
چۆنە مزگەوتی هەباساغامان ؟
تات و بەر سێبەر و تووی، هەر وا مان؟
وەکو ئەو سایە فەقێ دەخوێنن؟
وەکو من دەقنە لە ماڵان دێنن؟
کە دەڵێن ژینی منالّی گەمە بوو
ئەودەمە جێ گەپ و گاڵتەم ئەمە بوو
***
گاڵتەی ئەو سەردەمە
خواس و سەرقووت و لە خۆڵا گەوزیو
پیتی چووی پەل بوو بە دەستی قەڵشیو
ئیوهییە، تەوغییە، شەگگە و چگ و پک
لیکی زاری دەتکاندم تک تک
وەك هەلووک لێر و لەوێ هەڵدەبەزیم
سواپ و شیشۆقە بۆ چارەی وەڕەزیم
مەزرەقم یار و هەوڵ مەڕمەڕ بوو
قۆچەکانیم چەکی ڕاو و شەڕ بوو
خازەڵی و حەنزەل و ئاورۆچکە بە گشت
تۆپەڕاکردن و کەری سووری بە پشت
یان مەلا تەق تەقە یان هەنگڵەشەلە
جێژنە بوو ئەو هەلە، ڕۆیی بە پەلە
جەغز و سووڕدانی بە دەوری خۆما

لەو هەموو چەرخە خولێکم بۆ ما
تازە وا بوومەتە گۆچان بە دەسێ
لێم وەدی دێتەوە حوللەی مەرەسێ
ڕۆژێ ماندوو بە خەیاڵی شەو بووم
شەو لەبەر بەزم و گەمەم بێ خەو بووم
ڕێزە چوقلێ کە لەسەر هەورازان
یاری برژانگی منن هاوڕازان*
***
دیسان گەڕەك و جوانەکانی
»سەرخڕێ» زۆرتری هەمووان بەشی تۆم*
کۆرپەیێکی خڕەکەی باوەشی تۆم
یەکەمین جێیەکی ، لێم دانا پێم
کوڕی خۆتم بتەوێم یان نەتەوێم
گەڕەکی«قوبڵە» نەبووین پێیدا
بێ سەر و شوێنە وەفایی تێیدا*
شیرنێک لێرە بەناز تەشیەکی ڕست
شیرنی کێوکەنەکەی لەبرەو خست
گەڕەک«ئەرمەنی»ە بەهەشتی گۆرین*
ڕوو لە هەر لایە دەکەی، هەر حۆرین
سەردەمێک چاو ڕەش و چاو شینێک بوون
بۆ سڕی جەرگی تەزیو تینێك بوون
»سەرپلوسک» دڵ و چاوم لەوییە*
بەرەگە و ڕێڕەوی ئاسکی کەوییە
سۆفی گەر بەزمی بەهەشتت گەرەکە
توێژێ باوێژە، وەرە ئەم گەڕەکە
»پش قەلا» دێن و دەچن ئێواران
دەس لە مل تونگە لە شان نازداران
تاخی«حاجی حەسەن»ی لەو پەڕییە*
حەجی سەرویشکی نییە، دڵ تەڕییە
دڵبەخەم وەرگەڕێ زووی دێننەوە جێ
گەرمە ماچ خێرە لەجێ دەچنە حەجێ
***
ناو بازاڕەکە

بۆ هەژار دیتنی بازار دەردە
دەس کە والایە دەسی لێ بەردە
تۆ بڵێی، تازە بخوێن تێر و تەسەل
چای عیمادیش و کەبابی حەمەشەل*
خەڵکی بازاڕە کە هەروا مەردن!
گوڵی بەر دۆست و لە دوژمن بەردن!
چاخی دژواری لە مەیدان دەچەقن
تای تەرازووی یەك و تێکڕا دەتەقن!
هەر بە بێگانە دەکەن گاڵەی خۆش
دەردی سەرتیپە تەماتەی بێهۆش* !
***

بەستێن*
دڵە سەیرێکە لە دەم بەستێنێ
دیدە مەستێک لە منت نەستێنێ
چاوکەژاڵانی لە چەم ئاو دێنن
دەم بە جادون و دڵان دەڕفێنن
پرچە پڕچینە، کراس هەر چینە
هەر نزای گیانە لە ڕێی ئامینە
***

چوار چرا
چوارچرا ڕەنگە ببیسی دەنگم
وام لە سەر تێزە هەواخوای جەنگم
بەشخورا و مەرگی دەوێ ئاشتیخواز
گرێی دار ناشکێ بە بێ بیور و پواز
تۆزێ ڕاوەستە، ئیتر گوێ هەڵخە
ڕاخە کەوڵی عەجەم وخۆی هەڵخە
دەچەقێنینەوە داری تۆڵە
شاخی شاخدار دەپەڕێ بۆ کۆڵە*
***
کوچەی جوولەکان*
ڕوو لە کۆڵانی جووان کەین نامە

له هه‌مووی بیره‌وه‌ری خه‌یامه
ئه‌وی تێی نه‌چووه دڵی پڕ له خه‌مه
ته‌نگ و تارێکی هه‌بێ: پرچ و ده‌مه
ئه‌و کچه) جوو)انه که مه‌ی ده‌فرۆشن
نازی چاوانه به مه‌ی ده‌فرۆشن
***
جا چبکه‌ین ؟
له هه‌وار «ماملێ » مریه‌م بێنێ
هێند به ئارامی که شیر نه‌ڕژێنێ
جوانه چارۆکه به دابی بڵباس
له په‌ڕی مێشێ ته‌نک تر بێ کراس
ڕه‌نگی خۆش بێته په‌نای ده‌نگی خۆش
شێت و شوورن ده‌می خۆش بیر و هۆش
به‌سته‌یێکی من و ئاوازی ئه‌و
ڕازی دڵخوازی من و سازی ئه‌و
وه‌رگرین باده له ده‌ست مه‌یکێڕێ
خۆش و مه‌ستانه بڵێین چه‌ند دێڕێ
***
به‌سته‌که
ئه‌ی مه‌هاباد گوڵی سه‌رتۆپی زه‌وی
زیاد له هه‌ر جوانێ وه‌به‌ر دڵ ده‌که‌وی
هه‌ر که‌سێ جارێ ئه‌وتۆی ناسیبێ
خۆش و جوانتر ده‌بێ چیدی دیبێ!
کێیه ژیا بێ له به‌هه‌شتی خوادا
دڵی هه‌ڵده‌گرێ که لای لێ لادا!
***
ئه‌دی بۆ بێ ده‌نگن!
هۆنه‌ر و نووسه‌ره‌کانت له چییان
چۆنه تا سه‌ر به هه‌وای تۆ نه‌ژیان ؟
»خاڵه‌مین» زیره‌ک و پسپۆڕی چییه
چاوی سوور و ته‌ڕی وشک و سپییه!
تۆپ بوو، ئه‌و تۆپی که ده‌یگرت به زوخاڵ
گه‌نم و جۆ چاندنی هه‌ڵنا به ته‌ماڵ!

»سەوزە سیس» ناوی دەنێ کاری بەجێ
نیوە نووزەی مەم و سیامەند و خەجێ
ئەمە دەرمان نییە بیفرۆشی بە گەل
دەردی زۆری دەوێ شەل دەرچێ لە زەل
»هێمن» ئەو بولبولە سەر بێ تووکە
چۆنە لێی نایە چ جووکە و نووکە!
کوانێ ئەو سینگە کە» ماژینۆ» بوو!
سەر لە مەیدانی نەبەردا گۆ بوو
وەکوو بیستوومە لە مێروولە بەزی
دڵی وا گەرم و گوڕت سەیرە تەزی!
کوا تفەنگی دەس و ڕاوی کامە!
گۆشەگیری چییە ئاغای دامە ؟
بۆ دژە و ئەژنۆ دەباوەش دەگرێ
یان بە سەربەرزی بژی یان بمرێ!
نیشتمان هەر کەسێ بۆی بمرێ ، نەمرد
لەشی سەر دۆشە کە هیچ بەهری نەبرد
***
دەبا بیشێلم
لێم گەڕێ دڵ بە زوخاو و خوێنم
با لە دوور دوورە برام بدوێنم:
کاکە مەرجی من و تۆ کوا وا بوون؟
کەی تیانا بوو لە یەکدی جیابوون ؟
هەرچی دەرد و کوڵە بەر من بکەوێ
تۆش وەکو خۆشی بەجێ مێنی لەوێ؟
بیر و پێنووس و دەس و دڵ یەک بوو
دوانەیەك بوون و بەدەم یەک چەک بوو
تۆ ئەوینداری تەلان و بەرد بووی
دژی سای گەردەن و زێڕی زەرد بووی
سوێند و پەیمان بوو نەگۆڕێی، گۆڕای
وازی وازی لە سەری دای، دۆڕای
بولبولی کورد وەکو قەل دەنوێنێ
بێژی بێ بۆ کوڕی شا بخوێنێ
باڵی بشکێ و پەل و پۆی هەڵبوەرێ

مەل بکا زەمزەمە بۆ جاشە کەرێ
ئەوە چت کردووە بێ من، هێمن ؟
تێر و تانەت فرە لێمن، پێمن
نەت کرا بدڕی لەخۆت ئەو پەردەی
دەس لە گۆشتاو و پلاوێ بەردەی!
لێم ببوورە کە ئەوەند بەر لۆمی
شینە بۆ خۆمی دەکەم، تۆش خۆمی
ئێستەکەش نەچوە بچێ ، چوو ڕۆیی
وەرەوە ناو گەل و خزم و خۆیی
بۆ گەلت بێژە هەتا ڕۆژی مەرگ
بێ منەت، بێ تمەن و نان و بەرگ
ڕکە ڕاکە و ببە هاودەنگی خۆم
بێ کرێژ بە و ببە هاوڕەنگی خۆم
با دەسەومل مەلی بێچاران بین
هەر «هەژار هێمن»ەکەی جاران بین
نیشتمان وەک مەلە، نووسەر باڵە
هەر مەلێ باڵی شکا، جێی چاڵە
دڵە وشیار بەوە مەستی بەستە
ڕێ و شوێن بەرمەدە،خۆ دابەستە
***
گەشتێك بکەین
بەرەژێر ببیەوە، نوێژگەی سورە
زۆر مەلای لێن، کە نەچووم بمبوورە
لەو مەلایانە یەکێ زل جاشە
خەرتەلە و چاوی لە پێنج شەش لاشە
تاخی «دارۆغە»یە جێی بیرەوەری
بیر ئەوێستاش دەگەڕێ دەور و بەری
ترسی دارۆغە نەمابوو ئەودەم
دڵ بە ئاواتێ ژیابوو ئەو دەم!
»کۆپین ئاوا» دڵی هەر ئاوا بێ
زۆر دڵاوا بوو سپاردەی خوا بێ
تیری چاوبازێ لە جەرگم ڕاچوو
کوشتمی و خوێنەکەشم هەر وا چوو

***

لەسەر داشامەجید

وام لەسەر «داشەمەجید» وێستاوم
گیانە گەش بۆتەوە، ڕوونن چاوم
دڵە بێ دیدەنی ئەم دیمەنە کە
»لالەباس «دیارە لە گۆمی« تەنەکە«
»مێشە کورتانی» ببینە و«یەرغوو«
بێرەدا باری مەنیج تێپەڕ بوو
دڵگوشایە و گەشە «باغی سیسە«
ترسی ئەو ناوە لەو چاوی پیسە
ئاوی ئەسکەندەری لە شوێن وێڵ بوو
لە کن ئەو ئاوە خناو و لێڵ بوو
»کانی مام قەمبەر»ە لێی بڕوانە
دیمەنی جوانی دەمی جێژنانە
پڕ کەژاڵ، ئەو کەژە زەرد و سوورە
چت دەوێ بەر دەمە، هەر خەم دوورە
پیرە سەر سەوزەکە«ئەسحابە سپی«
بوویە پێشێلی عەجەم بۆیە کپی؟
تووکی تۆ وەرگەڕێ تەختی تاران
تا بەهار ببیەوە جێی دڵداران
»گومبەزان» جێگە نیاز و ڕازە
چیت نیازە وەرە لێی بخوازە
کورد و ئازادی بە یەکتر شاد بن
دوژمنان ببنە گڵ و بەر باد بن
»باغی شێخی»گوڵی ناو باغانە
سەیری هەتوانی جگەر داغانە
سەر لە ئێوارە سەرێک هەڵبێنە
ژین وەسەر بگرەوە خەم بپسێنە

***

ماڵاوایی

چۆن وەها شارێ لە سەر دنیا بێ
بە خەیاڵا دێ کە مانگ ئاوا بێ
سا مەهاباد بە هومێدی دیدار

تاكو دەت بینمە ئازا و ڕزگار
***
با لە شار دەركەوین
داوەتم دێنەوە بیر « زاوا و بووک«
وەك سەری هێمنی تۆڕ و بێ تووک
لێرە«لاچین» وەرە » شیلاناوێ«
کۆنە لانمانە بمێنین تاوێ
شایی هێمن بوو هەژار هەڵدەبەزی
دۆیەکی هاتە دەسی و جەرگی تەزی
***
سارەوانان
سارەوانانی تەمەن خۆش ئاژۆن
بێ وچان دەیدەنە بەر تازە و کۆن
»سارەوانانە» دڵت بۆ لادێ
هیچ لە دڵتا هەیە یادی یادێ!
بە نەمامی گەش و شەنگ و شل بوو
بە نەکامی بەرەو مردن کل بوو!
***
بەسری
لەو بەرەت « بەسری» دەسی دز ببڕە
لەو سەرەت ئارەقی ماندوو بسڕە
***
سەری سوڵتان
»سەید وەقاس» هەر بەگەڕی ڕەشبەڵەکی
وەکو جاران بە کڵوك و کەڵەکی*!
خۆشی بۆ تۆیە دراوسێ جوانی
دۆستی تۆن «قەمتەریی» و«دەرمانی«
لایەکت «چۆمی مەجیدخانی « بەرین
ماڵ و قۆپی هەموو پڕ پۆڕ و پەرین
ڕاسپێرە لە قەلا بۆ » کاکم«
هیچ قسەی ماوە! دەڵێ بێ باکم*!
گەیوەتە کوێ ! شەڕی ئاغاو گوندی!
سەیری دنیا کە چلۆن بوو، چن دی!

کۆنە « سوڵتان» و«سولەیمان« ڕێوین
شێت و خوداری ختەی بێ خێوین*
کۆسە بۆ ڕیش دەگەڕا و بۆ جاشی
داشی هات کلك و سمێڵی تاشی*
***
ئیسا کەند*
باشە شەوباشێ لە »ئیساکەند» کەین
یادی یارێکی دەم و لێو قەند کەین
شاڵ شلێ، چاو بە کلێ، لێو ئاڵێ
چۆیلەکێک بووم بە دەسی منداڵێ
***
سەیدی کاکەجان*
»کاکەجان » پیری «سەهۆلان » هەر هەی
نیاز ڕەوای لاو و کچۆلان هەر هەی!
***
بەرەو پیر
گیان لە ڕێ چوونی بەلەز دەمدا هان
کەوتە بە کێشەری « پیری بورهان*«
مانگە زەرد بوویەوە؟ ڕۆژت دیوە؟
دیارە تۆ بەر لە منت ناسیوە
دڵە دامرکێ ، خەیاڵ لێم لادە
گیانە بۆ دیتنی پیر ئامادە
»کانی دولمانە » لەسەر ڕێگامان
خۆت بشۆ بێ چەپەڵی بێ ئامان
جێ گەلێ پاکە ئەتۆش خاوێن بە
بۆ هەموو سووچێ دەسە و داوێن بە
لە «لووساوکان»ەوە خۆش ڕابرە
دەس بە دەم نەوسی چنۆکا بگرە*
لە هەموو لاوە گوڵ و گوڵزارە
شینییە ، جوانییە، ئاوە و دارە
دڵی شێت چەپکە گولێکیش بچنێ
باشە هۆشی هەبێ هێشوو نەڕنێ
***

گومبەز
گومبەزی سپیە وەکوو ڕووی پاکان
پاکە وەک گیان و دڵی دڵپاکان
سەدەفە و گەوهەری یەکتای تێدا
بارەگاهێکە شەهەنشای تێدا
ماڵی سەرخێڵی خودا ناسانە
بێرەدا چوونە بەهەشت هاسانە
لێرە کەشکۆڵی هەژاری تژییە
هەرچی ئێرەی هەیە، چاوی لە چییە!
ڕۆژێ تینی بە گەشە و تیرێژە
ڕۆژێ دینی گەش و تیشک ڕێژە
تیشکی ئەو کاری بە خۆڵ و خاکە
شۆقی ئەم گیان لەبەری ڕووناکە
گیانە تا هەل هەیە لەو جێ گەورە
بدە حەو جاری وەکو حەج دەورە
لێی بپاڕێوە، نزا لە خودا کا
با گرێی کاری هەژاران ڕا کا
کوردی بێچارە هەتاکەی دیل بن!
تۆق و کۆت هاودەمی پێ وو پیل بن!
خوا نەناسان و چرووک و پەستان
بەس بگەوزێن لە چیای کوردستان
بەرزەیی هەوری لە کەژمان هاڵێ
زبڵ و زاڵی دەسی زۆر ڕاماڵێ
***
سەید ڕەشید
وەرە سەر گۆڕی شەهیدی دڵتەڕ
هەموو دنیا لە بەرێ، ئەو لەو پەڕ
»چاوەشی»پیر بە هەوای زانستی
لە ملی شێری دەخستن ڕستی
***
نورانی و مەولانا*
گۆڕی نوارانییە، مەولانایە
کەسی وا گەورە لەمەوەلا نایە

***
لەسەر گۆڕی دایك و باب
گیان وچانێ لەسەر ئەم دوو گۆڕە
دڵە خوێن هەڵ بدە، چاو داچۆڕە
دای و باب لێرە بە خاک ئەسپێران
بە پەکوو بوومە پەپووی جێ وێران
***
دایک دەدوێنم
دایە شەوگاری درێژ گریابووی
بۆ کوڕت دڵ بە نزا و بریا بووی
دەتەویست تاکە نەمامی ساڵت
بەری شیرن بێ لە ڕۆژی تاڵت
گوڵ و لک بلکێ بە دەور و بەریا
ئارەقت بسڕی لە بن سێبەریا
برتە ژێر خاکەوە ئاواتی دڵت
هەر بەهارت بوو وەرین پەلکی گوڵت
ئاە و زوخاوی دڵەی پڕ سۆکەت
دڕوو دەڕوێنێ لە بان گڵکۆکەت
***
ڕوو دەکەمە بابم
باوە، نیازت بوو وەکوو تۆ وابم
لە جیهان دوورە پەرێز، بۆ خوا بم
پێت وتووم چەندی لە تۆم پرسیوە
نیشتمان دۆست بە، خودات ناسیوە
هەرچی فرمێسکی هەژاران بسڕێ
بۆ دوا ڕۆژی بەهەشتێ دەکرڕێ
نیشتمانم کە ڕوانیم، دیلە
باغی وا خۆش بەرڵا و بێ چیلە
تورکی تورِ، توڕی دەدا بۆ بەرپێ
لێی دەگەوزێن عەرەبی بێ دەرپێ
مشکە کوێرەن عەجەم و ڕیشە بڕن
خێوی باغ برسییە، ئەو تێر و مڕن
نیشتمانم کە دەویست، کەوتە دڵم

بێم و پەرژینی بکەم باغی گوڵم
وارشی گاڵە درێ و دەربەست بێ
بەس لە داگیرکەری پەست، پێ پەست بێ
***
چ هەژارم نەدی، وەک کوردی هەژار
چاو بە ئەسرین و، سڕی دەس زۆردار
خێوی خەرمان خڕی بێ نان دەنوێ
گەلە خوێ پێوە نەبێ داس بسوێ!
خۆی، ژنی، کیژ و کوڕی کووڕی مەڵۆ
وەکو جووچک دڵە لەرزەی لە هەڵۆ
گەنم و جۆ، ڕۆن و خوری و تووتن و نەوت
گۆشت و میوە و بەری لێڕی شەش و حەوت
هەرچی داهاتە لە لادێ و شاران
بگرە هات ! ئەنقەرە، بەغدا، تاران
گورجێ دەیقۆزنەوە دەستی بە خوێن
نانی پاک بەو دەمی پڕ جوێن دەجوێن
هەستی من ویستی کە دەستیان ببڕم
لە هەموو چاوی تەڕ ئەسرین بسڕم
ئەو دەمەی دابدڕم کورد دەخوا
لای هەژاران بم و نێزیک بە خوا
***
چم بەسەر هات!
سەربەخۆ کەوتمە شوێن ئاواتم
دوور لە تۆ تووشی نەهاتی هاتم
ئابڕوو تایەک و حیزی تایەک
سەرپشک تەک بدەمە هەر لایەک
خوێڕیەتی خوو بدەمێ نان زۆرە
دەفڕێ ناموس و شەرەف پێخۆرە
دەستی پانم لە بنی باخەڵ گرت
ئابڕووم ویست و سەری خۆم هەڵگرت
ئەوە چەند ساڵە کەوا دەربەدەرم
لە گوتن نایە چ هاتە سەرم
ڕوو لە سووچم، وەکوو تۆز بێ بایەخ

عاسمان لێفەیە هەردم ڕایەخ
هەر بەلای بووری گرێی دا هێڵە
شووم خەتی خۆشە لە کێڵگەی توێڵە*
جوانی وەک ژینی کوڕێنیم دەرچوو
سپیەتی ڕووم خزی بۆ مووی سەر چوو
زەردە بۆ لێو کە دەهات لاڕێیە
پەڕیە سەر ڕوومەت و تاپۆی پێیە
خەم ڕەوێنم خەمە، کەس هەر کەسەرە
دەردی دڵ چاری دڵی دەربەدەرە
خۆشی وەک ئێوە مەگەر بێتە خەوم
گەر هەبێ جێگەیێ لێی وەربکەوم

........................................................

1- ڕوو لە گوناهم. یان وەك تۆز فڕێ دراوەمەتە قوژبنەوە بێ قیمەت.
2- هەر بەلایەکی ڕابرد نیر و ئامووری دابەست. شێوەردم خەتی ورد و خۆش بووە لە کێڵگەی نێوچاوانم. یان نەگبەتی ئەوەندەی مەشق کردووە خەتی خۆش بووە و خەتەکانی گنجی نێوچاوانمە.

........................................................

چاوی ژیرم هەبێ خەو بنوێنێ
نوێنی زبر و تەڕی نەی تۆرێنێ
وشک و زەرد، لەش بە دڕک بەر لێژم
سووک و بەر باد و بە سووڕ و گێژم
قانگەلاشێک و لەبەر دەم باوە
یان تەلاشێک و بەسەر دەریاوە
گا بە شێواوی لە چۆڵێ دەکەوم
گا لە گێژاوی شەپۆڵێ دەنەوم
***

هومێدم هەر ماوە
لەو جیابوونە کە جێگەم جێ ما
شادی داکەوت و هومێدم پێ ما
ڕەنجەڕۆ بووم و لە ڕۆ ناڕەنجم
تا هومێدم هەیە خاوەن گەنجم
دڵ بە ئاواتەوە ماوەی بدرێ

پارچە پارچەی لەت و کوت گەو بکرێ
باغی زێد بێتەوە دەستی خێوی
دەستی کورد بچنێ هەنار و سێوی*
پڕ نەمام بێت و نەمام پڕ گوڵ و چڵ
چاو پەپولێک بێ لە پەرژینی بە گوڵ
گیان بە هەر لایەکی باغا بفڕێ
گەشکە بێ و چاوی بە گریان بسڕێ

.............................................................
*سەیفو القضات، شاعیری موکریانی لە شیعرێک دا دەڵێ : «تاکەی لە باغی خەڵکی بە زیزی و بە ملکەچی
خۆشە لە باغی میللی چنینی هەنار و سێو.«
.............................................................

ئەو هەلە هەلیە لە عاسمانی کورد
سەربەخۆ سەرکەوێ لای وابێ نەمرد
لەش لە لای ئێوەوە بسپێرێ بە خاک
خۆشە لای دایک و کەس و باب و کاک
خواش کەسی بێکەسە بۆ ڕۆژی ژمار
زۆر دلاوایە دەبووری لە هەژار
***

دیمەنی گۆڕستانەکە
گیانە بڕوانە چ گۆڕستانە!
جێ وچان و خەوی چاو مەستانە
سوور ئەوا پێتی دەڵێ شللێرە
کۆڵمە ئاڵێکە لە ئاخا لێرە
ئەو وەنەوشەی کە لەسای دارانن
شینی سەر شینی گرۆی یارانن
خاك و خۆڵی هەموو گەنجە و سامان
چاوی بادامی لە ژێر بادامان*
***
جۆگەی قوڵقوڵە
لاکەوە دڵ پڕی زوخاو و کوڵە
وەرە سەر قوڵقوڵە فێنکایی دڵە

مسته ئاوێکی به ڕووی دڵ داکه
ڕوو به ڕووی تەکیه دەبین ئەو ساکه
***

خانەقا
خانەقا دار و دەرت چیمەن و چیم
له هەمووی هەڵدەقوڵێ بیرەوەریم
تات و ئاوی ، بەر و ناوی حەوشان
هەر له میحڕابەوه تا جێ کەوشان
میچ و بان ، ڕێڕەو و مافووره و بەڕ
تووەکەت، ڕێزی چنار و عەڕعەڕ
وشك و تەڕ حەوز و دەر و دیوارت
تازه و کۆن و خویا و پێوارت
ژوورەکانت چ له بەردن چ گڵن
حوجرەکان. گشتی لەمن نوشته دڵن
داخۆ ئێستاش وەکو پێشوو ماوی!
دڵنیا و دڵگری پیر و لاوی!
پیت و بەهریان هەیه لاوی دڵسۆز!
سۆزی دڵیان هەیه پیری پیرۆز!
کێ له جێی« جەعفەر»ه بۆ ئاوردوو!
کێ هەڵی دەگرێ سەوەی پڕ نردوو!
کێیه وەکوو «حاجی» نەهێڵێ چەپەڵی
کێ بەفر دێنێ له جێگای «شخەڵی«
»شاپەسندێ» هەبوو میکایلی گەل
ڕیشه جوار گۆشەیەکیش زۆر تەوەزەل
مامۆستا مەنگوڕەکەم حاڵی چییه ؟
»شێخی شامی «وەکوو ڕیش سپییه ؟
کێ وەکو« سەید»ی دەس و دڵوازه
تووتنی کۆنی هەبێ و چای تازه ؟
»مەمەیار» «کاکی مەلازاده»ت چۆن ؟
کێوه چوو تازه موسوڵمانی کۆن ؟
کەڵله زل پیری فەریک» چی لێهات؟
شێری بەگزاده گەڕۆکی دێهات

کێ لە جێی ئێمە فەقێ و نان خۆرن
تەمەڵ و بۆرە کەمن یان زۆرن ؟
هاودەمی ئەودەمە سێ شێخازدەن
داخوا بۆ ڕاوە کەوان ئامادەن ؟
خێوە کەو هەر هەیە قێڕە و سوێندی
بۆنی با هات و کەوی شەو خوێندی
قازیەک و مینە و دەورێشێک بوون
هاو دزی شەو لە مریشک و قەلەموون
کێیە پیر؟ کێیە مناڵ؟ کێ گەنجە ؟
کێیە پێم خۆش بووە؟ کێ دڵ ڕەنجە ؟
کێ بووە ؟ کێ چووە ؟ کێ وەك خۆیە؟
دێ و دەچێ ژین وەکوو ئاوی جۆیە!
***

شێخ محەمەد
سەروەرێکت هەیە پێی دڵشادی
تا ئەوت ماوە لە خەم ئازادی
خۆشەویست« شێخ محەمەد»ی ڕیش سوورە
لە خودا یار و لە دنیا دوورە
چۆڕە ئاوێکە لە دەریای بێ پەی
دڵی دەریایەکە پەی پێ نابەی
وا لە جێی پیر و بە بیریش پیرە
لە نەزان شێرە، بە زانا ژیرە
سەد بری هێندە برای نەبوایە
پاك و بێ گورگە بۆ ئەم کۆگایە
تووک سپی زیانە لە پەمبۆ تۆزێک
ئابڕوی هۆزێ دەبا ڕەشبۆزێک
***
بەرەو دۆڵی ئاجیکەند
باغی فاتێ مەڵێ بووری و خۆی بوارد
گەردن ئازاکە گەلێک میوەم خوارد*
دامە گوارتە گوێ لەسەر دزیەکی باغ
باغەوان لێم دەگەڕا دەس بە پەیاغ

***
وا شەڕەفکەند پڕی شۆخ و جوانە
کوڕە شێخ تووڕە دەبن مەڕوانە
جێی دڵە باغی مەلا و ئاجی کەند
هەر گوڵە و بولبولە هەر سازە و بەند
باغی باخچان و نەمامی ساوا
چۆن دڵاوایەکە ماڵی ئاوا
هەرچی گێلاس و بەڵاڵووکی خوارد
سەری هەوساری بە زاری ئەسپارد
سێو و مێو بەردەڵە قەیسی بەڕمێن
ئەوی زۆر تر گز و فت دەن هەرمێن
گەر بکا چاوی خومار ڕزگاریت
وای بزانە لە بەهەشت ڕێبواریت
بێ ترس بیخە سەرت تەشتی تەڵا
نۆبەتێ زۆرە مەچۆ تازە قەڵا
چاوگە سەر ئاشی خوراسانەش بێ
خۆشە ئەو بەندە لە سەر چاوەش بێ
»گەردشی چەرخە مەداری مەلەکە
ئاشی شێخ بابە قەتاری گەرەکە«
دێتە دەر ئاوێ لە سایەی داران
چارە بۆ کۆخەڕەشە و بۆ ماران
با وەخۆین من عەجەمم کۆخەڕەشەن
دەشگەنە ماری مژی مژ بە ڕەسەن
سەردەمێک ببوە بەهەشت ئاشی گوڵان
گیان لە زانست دەگەڕا و دەم لە چڵان
»سەردەراباد »نەچی خێوی لێیە
بە تەنێ باری هەژاریت پێیە
لەم «عەزیز کەند»ە بە ناو باخچێک بوو
جوان و بەرچاو و لەبار و ڕێک بوو
سەری سەودام هەبوو لام دایە کنی
کاڵە هەرمێم کوشی، سنجووم نەڕنی
***
تەرەغە

تەرغە خۆشی سەرت هەر بەرزە
لێک جیابوونەوەمان چەند وەرزە ؟
یاری ڕاکردوو دەمی ڕابردوو
وا بەسەر تۆوە کڵاو بابردوو
هەر لە لانن! دەمەوێ سەیری بکەم
سەنگەری سارمی خوێن ڕێژی عەجەم
دێنەوە بیر کوڕی کورد، مەرگی دەوێ
ئەو سەرەی ناوێ بە حیزی بنەوێ
کارگ و ڕێواسە بەهارانە بەرت
وەکوو جاران کوڕ و کچ دێنە سەرت!
گەنجی ئاواییەکە چۆنن ! سازن!
دڵتەڕن ! دەس لە ملی دڵخوازن!
جوانی ئەوساکە ئەوێستا پیرن!
هیچ لە لات وایە لە من دڵگیرن!
جوانی جێما کە نەمام لەو نێوە
داری دوری بەری پیری پێوە
تۆ کە قیت ماویەوە بارت بارە
هەڕەمەی جوانی لە تۆ ڕا دیارە
باخچەیە سەریەتی چواردیوارە
پاش بڵاغە و قەرەڵی و نۆبارە
کانییە ڕەش لان و مەکۆی چاوجوانان
بەند و باون لە دەمی خۆشخوانان
زانین ئاوات کە لەبن باڵایە
گش لە لاوچاکی دەسی باڵایە
***
یادی دڵدارێك
داخەکەم باوی کوڕێنیش لاچوو
هیچ هەتا سەر نییە وا هات وا چوو
چاو شەهێنێک دڵی گرتم ئەوسا
چەن لەبەر نازی ئەوا گیان چەوسا
تازە لاوێ دڵ و ڕوومەت سادە
مەستی سەرخۆش دەگەڕام بێ بادە
ڕێ نەدیو، چاو دەگەڕا بۆ باڵا

داوی دڵداری لە گەردەن هاڵا
بەرزە دیوار و بەهەشت لەو دیوە
دەرکە داخراوە، کلیلی زیوە
دانە فرمێسکە لەلام سوێراوێ
دڵ هەیە و سواڵەتە لەتیان ناوێ
نەمبوو سامانێ جیا لە جوانی
جوانییەکەش توایەوە تا پێی زانی
مامەوە، توامەوە، برژام، ئێشام
بەزەیی هات و دەسی ڕاکێشام
چاوی خۆم کردەوە وام لەو جێیە
سۆفی پاش مردنی هیوای پێیە
زەردی تاوداری هەژاری بێ بەش
تاو بڕا و کەوتمە سایەی باوەش
توانە، بووژاوە بە ماچی لێوان
گیانە، ژیر بۆوە لە سەیری سێوان
ئەودەمانەی کە لە باوەشیا بووم
ئادەمانە لە بەهەشتا ژیابووم
گوڵی سەر کۆڵمە گەشەی تیشکی چاو
ئارەقەی خۆشی دەکرد بۆنی گوڵاو
سێوی لاسوور سەری گۆنای ناسی
داخ لە دڵ خۆی بە پەلێ هەڵواسی
دەمی شیرین بوو لە دەمیا هەنگوێن
بادە دادی بوو لە لێوی ڕەنگین
خونچە دەم سوورە لە سەر لاسایە
زۆر دڵی تەنگ بووە هەر بۆی نایە
تا بهاتایە بەرانبەر لاجانگ
لەشی سەر ئاو دەگەڕا تیشکی مانگ
لاملی، ئاسک و کەوی خستە گرەو
تۆقی گیرۆیی ڕفاند گەردنی کەو
زێڕ دەلەرزی لەپەنای گەردەنی زەرد
تاو و تینێکی نەبوو، زەرد و سەرد
شانە هەنگوێنی سپی سەر سینە
بۆ تەماشا بەشی سەر تا سینە

گەر پەپوولەی چەمێ بەو جێ فێر با
باڵ لەبەر چاو بوو دەترسا کوێر با
خڕی ناو مەم پڕی ئاونگی گەزۆ
شیری خاوی لە دەما بوو لیمۆ
مەمکی بدیایە چ ئادەم چ ئەوا
بەلەز دەیقۆزتەوە هەر کەس لە هەوا
لار و لەنجەی کە دە لای«لالەش»دەخست
کێ مەلەک تاوسی پێشووی دەپەرەست!
پرچی پڕ پێچی قەد و باڵا بوو
ڕەشە ماری لە نەمام هاڵا بوو
هەر لەسەر نێوکەوە تا بەر ئەژنۆ
لەرز و موچڕکی لەشی تامەزرۆ
جیوە لای هێندێ لە ژێر پشت بەندی
ئابڕووی چوو بوو لە توندی و مەندی
شلکەڕان و قەفی تێراوی بەلەک
مۆمی کافوور لە پانایا بەلەچەک
تام و ڕەنگێ لە لەشی ئەو دا بوو
ئارەزوو واقی تیا وڕ مابوو
لە هەموو لاوە گوناه بانگی دەکرد
هەرچی لەو میوەیە چێشتوویە نەمرد
تاوسە، مارە، نەمامی بەژنە
پێم دەڵێن بچنە بەشی خۆت بڕنە
دەنگی« تۆم خوش دەوێ، تۆ خۆشت دەوێم ؟«
گیانی کێشابووە پەنا پەرەدەی گوێم
دڵ لە دڵ نیازی نزیک بوونی دەبیست
دەمی نای نازی دەگوت ، ماچی دەویست
لێوی ئاوی دەمی دڵی دەتکاند
چاوی شەرماوی لە چاوم دەچەکاند
وەک ئەنی و چاو و چەن و دیم و دەم
خاڵی ڕووی خۆی دەنوان ماچی کەم
چاو بە چاو، دڵ بە بەرامەی مەست بوو
مێشک و هۆش و ڕەگ و خوێن بێ هەست بوو
هەر لەبەر پێوە هەتا تۆقی سەرم

له گەڕاندا بۆ تەزووی سارد و گەرم
ناسکە پەنجە و مەچەک و باسک و زەند
دینی بەردا و ملی تۆبەی هەڵکەند
بەرەژوور چوو کەف و کۆی لاوچاکی
کەوتە دوایێنەوە داوێن پاکی
بوومە ڕەزوان لە بەهەشتی جوانی
لە گوناه تامی ژیانم زانی
ئەو ژیانەی کە لەگەڵ ئەو بووری
خۆشی کرد ئاگری دەردی دووری
وام بە پیریش بە خەیاڵی ئەودەم
پەل بە سینگ دادەکوتم لە شوێن مەم
***
دیسان ڕوو دەکاتە تەرەغە
لادرێ تاڵی خەیاڵی لاوی
بادرێ باشترە داوی خاوی
کەژ و کۆی دۆست و دراوسێت چۆنن!
دڵ و ڕووخۆش و گەشن یان مۆنن!
هەر بە قەزوانە ملی «پیرسڵەمان!«
تەڕ دەژی دوورە لە ئاسۆگی نەمان
زۆر لە دەورەی دەگەڕێن بەنیازان
دۆ بەهانێکە لە کن دۆخوازان
»کۆشکی زارا»کە بە خەیاڵ نەخشاوە
هەژدیهای نەمری لە داوێن ماوە!
شانی »میرقازی» پڕ و بژوێنە
زیندەوەر لێی دەگەڕێن، دژوێنە!
خۆش بووە» پێمەڕەکەی فەرهادی«
بۆ سەری دوژمنی ڕێی ئازادی!
تەرغە، کێوی لەمێژینەی کورد
کۆنە هاوڕازی«سەفین» و «هەڵگورد«
»ئاگری»و «پێرس»و» مازی» و « ساسۆن«
خزمی«پیرانی»کەس و کاری تۆن
لە لۆرستانەوە تا پشت«تۆرۆس«
گەلێ زۆرن بنەماڵەی «زاگرۆس«

کورد هەزاران و هەزران ساڵە
سایە پەروەردە دەژین لەو ماڵە
ئێوە بوون، پشت و پەنا و دژداری
نان بدە و یار و دژی بەدکاری
پیاوەتی و مایە ژیانی ئێوەن
مانەوەی ناو و نیشانی ئێوەن
کێوی «جوودی»لە گەڕی تۆفانا
گەمییەکەی نووحی لەسەر سەر دانا
پەندی پڕ بایەخی پێشینیانە
»کورد لە تەنگانە تەلانی لانە«
»چیای مەزن لێی هەبێ بزن و هەرزن
نابەزن بۆ کەس و هەر سەربەرزن«
ئێوە دیتان بە سەتان خونکاران
زۆرو بیست هەو هەو و خرمەی سواران
پانی پاڵ داوە دەمێ «بانیپاڵ«
ڕێوی لێ کردنە کوێخا بە خەیاڵ
گەلێ ئەسکەندەر و زۆر وەک زەنفۆن
دانی هەڵ بڕیەوە ئەم کوردە بخۆن
عەرەبو هات بەسەرا وەک لێشاو
بێ بەزەی دڵڕەشی فێڵبازی بە داو
چەنگی چەنگیزی بە خوێن پاراو بوون
بۆ هەلاکۆ بەرەگە و سەر ڕاو بوون
جارێ تەیمور بە شەلی سەردەکەوت
تیری کوێری کەڤری بەر دەکەوت
شاعەباس ویستی سمێڵ بابڕ کا
کێو لەبن بێنێ ، گەلی کورد قڕ کا
نادریش سوڕی لە زۆر جێگا دا
بە هەڕ و گیفەوە خۆی لێ بادا
زۆری زۆردار کە سەرێی پێو وێران
بە ملی وردەوە لێو هەڵدێران
زۆر گەماڵ داویە گەمارۆی ناومان
ئێمە هەر ماین و ئەوان بەدناو مان
هاتن و چوون زلی زۆر خاوەن زۆر

کوردستانگر بە خەیاڵ و کورد خۆر
شرت و گوم بوون و هەموو ڕابردن
کوردستان هەر هەیە کورد هەر کوردن
بەڵگە بۆ چەنگە چەمووش و تۆزێک
دێتە دی لێر و لەوێ چەند گۆڕێک
خواردنی کورد و چیای دژوارە
دەرنەچوون فیل و نەهەنگ لەم بوارە
تازە وا مشک و توڵە و وشتری گەڕ
بە تەمان بیکەنە جێ مۆڵ و گەوەڕ
خاك بەسەریان بێ وەکوو پێشوویان
دەبێ نێهێننەوە هەرچی جوویان
شل نەما کوردە پەڵووڵەی دوێنێ
ئێستە وا توندە ددان دەشکێنێ
سەردەمێک خاوی مەلا و خانان بووین
پاروە خۆشەی دەمی بێگانان بووین
ئێستە ئەو تاوە لە ئاوا بوونە
شێری کرژ نیازی لە لان ڕابوونە
تۆڕی دیلی لە پەلان هەڵ دەدڕێ
کێ بەشی خواردووە گورچووی دەبڕێ
دێتە گوێت گەرچی کڕ و بێدەنگی
دەنگی پێشمەرگەت و زەبر و زەنگی
داد و هاواری عەرەب لەولاوە
تینی بۆمبا و کەڤری تاواوە
ئەمە بوولێڵەیە بۆ ڕۆژی ڕوون
بانگەوازیانە کە ڕۆڵەت زیندوون
بێنی خوێن، دووکەڵە شینکەی باڕووت
با کە بۆت بێنێ لەسەر خۆ بێ پشووت
تەمی خەم نەتگرێ بڵێی چارەڕەشم
شۆڕشی کورد هەیە من دوورە بەشم
ئاوەدان دەبنەوە ناو سەنگەری تۆش
دڵ پتەو بە بەهەوای ڕۆژی خۆش
تازە دەکرێتەوە دوژمن کوشتن
ژەنگی سەر دڵ دەسڕێ خوێن ڕشتن

ئاگرت هەڵبێ وەکوو ڕابردووت
لاشی دوژمن دەکەمە ئاوردووت
ڕۆژ دەبێ ناوی هەژار نامێنێ
سازی ئازادی لە ڕووت دەخوێنێ
خوات دەگەڵ بێ تەرەغەی قیت و قۆز
جەژنی ڕزگاری نزیکت پیرۆز
***
یادی جوانەمەرگێك
»پیرمحەمەد » تەڕە تیراوێی دڵ
تۆز و هەتوانی دەست خوێنە و گڵ
گیانە پڕ سۆیە برینی دەرکا
گەشە خوێناوێ لە چاوم سەرکا
جوانەمەرگێ هەیە لەو داوێنە
خاکی نمدار کەمەوە بەو خوێنە
جەرگی تۆ و بەرگی ژیانی من بوو
گەوهەری نەرم و نیانی من بوو
بەر لە ڕۆژانێ ئەوم پێ ناسی
سەر لە سوڕا بوو بە گێژی و کاسی
دەس لە دڵ تەنگتر و ناز شێواو بووم
زۆر لە داماوی پتر داماو بووم
گیان لە خۆیلێنی گومانا وێڵ بوو
بواری بەرباری بە دیمەن لێڵ بوو
داوی ئاوات و هومێدان باریک
تەم تەنیبووی سەر و بەر چوو تاریک
لەپڕێ پەرییەکی نازدار و شەپاڵ
ئاسکی ناسکی شیرین خەت و خاڵ
بوو بە دەستگرتەم و شایی شاندام
ڕوو بە ڕووی باغی ژیانی هاندام
ڕابەرم بوو لە ڕچەی دڵ پتەوی
ورە بەربوونی نەبوو، ببوە کەوی
کیژی تۆ بوو بە فریشتەی بەختم
تەختی کرد کەند و کلۆی ڕای سەختم
تای ژیانی لە ژیانم هاڵاند

تا ئەوم بوو لە ژیان نەمنالاند
شەو چرایەک بوو لە ڕۆژی ڕەشما
بەختی بێدار بوو لە ناو باوەشما
گێژەڵووکەی ڕەشەبای مەرگی نەکاو
گشتەکەی کردەوە یەکباد و خاو
هەڵوەری سوورە گوڵی بولبولی دڵ
شینی بۆ ماوە لە جێی چۆڵی چڵ
تازە پەروانە دەسووتا باڵی
بای نەهات شەوقی شەماڵی ماڵی
یار لەگەڵ بەختی هەژار ڕێك کەوتن
دوور لە من چوون و لە خاکا خەوتن
***
خوا بژاردیەوە
گەرچی خوای گەورە بەزەی خۆشی نارد
گەڕی گەردوون چ بوو تاوانی بژارد*
دەردی بێ هاوسەریی دەرمان کردم
ڕەقەنی بێدەری نەرمان کردم
جوانترین پەریەکی خۆی خستە پەنام
باغی شادیم لە گوڵە و تازە نەمام
ئەو هەموو کۆسپە کە دێتە سەر ڕێم
ئەو هەموو داوەی دەپێچن سەر و پێم
ئەو هەموو تاڵییە من دەیچێژم
ئەشک و خودانێ کە من دەیڕێژم
هەرکە خۆم خستەوە سەر شاباڵی
بەرگی ژان و شەکەتیم داماڵی
چەند پەژارە و کزی زۆری بێنێ
یەکی نامێنێ کە ئەو دەمدوێنێ
چاوی نەرمی کە دەچاوم دەبڕێ
ژەنگ و فرمێسکی دڵ و چاو دەسڕێ
دینی ودمە، دەسی هەتوان پێژە
تا هەیە کۆنە برین سارێژە
***
بەو حاڵەش

هێشتە تا با لە موکریانەوە دێ
نیازی سەردانە بەلای گیانەوە دێ
دڵ دەورتێنێ لە سوێی ئەو ناوە
سەرە تیرێکی تێیا جێماوە
جار و بار خوێن دەدەڵێ و دێتەوە سۆ
خوێن و گڵ تێکەڵە هانامە بە تۆ
پیری دڵ چاک ئەوە خۆت و ئەوە دڵ
دڵە ئارام بە لە دەرمان مەکە سڵ
***
بەرەو بۆکان
بەس خەواڵوو بە خەیاڵ بڕوانە
شاری بۆکان وەکوو بووکان جوانە
مێشەیە، باغە، گوڵستانە، چەمە
لاوی لاولاوە، کچی خونچە دەمە
ئاوی چاوێک لە دڵی ئەو دایە
چاوی قرژاڵی لەبەر هەڵنایە
مانگ لەمێژ ساڵە لە ڕێدا فێرە
وەك تریفەی مەلەوان بێ لێرە
تۆش بچۆ، گیان و دڵیش ئامادەن
ترسوو داماڵن و خۆ پێدادەن
مار و جرجی عەجەمو نایەنە بەر
شەو لە ترسان لە کونان نایەنە دەر
ئەو قەڵایە کە بەرز وێستاوە
دوور لە وێستاکە هەوارگەی پیاوە
سەر سەرا و کۆشکی گەلێ سەردارە
بۆتە بەردار، چ خودا بەردارە ؟
پیاو نەمان و ئەوی مان خوێڕی بوون
هێڕ و وڕ فێری خڕەی زێڕی بوون
کوردە نامووسی فرۆشرا بە چڵە
گای شڵە گشتی لە خۆ بوونە مڵە
هەرکەسەی ببوە کەوی دەس دوژمن
دەیەویست خزم و کەسی خۆی قڕ بن
دان دران تاکوو لە کێو کەو دەفڕی

کاتێ تاران سەری وانیشی بڕی
کەوی سەرداری لەبیرمان ماوە
کە لەسەر چی سەری هەڵقرتاوە*
بەسە خوێڕێژی بەسەر زاماندا
با بنوارین بە هەموو ماڵاندا
ئاخۆ یاران وەکوو جاری جاران
شەو نشینیانە لە پای دیواران!
ئەمجەد و قازی مەلا ڕیشی حەسار
کێ بەئاخ و کوڵە بۆ ڕەنجی خەسار*
شێرە چۆببینە بڕشتی ماوە!
یان کەل و کول بووە، کۆڵی داوە!
پیرە شاهۆی قەرەگوێز هەر بە گوڕە!
یان عەجەم ترسی وەبەر ناوە کڕە!
لەمڕۆ داخۆ برای ڕاست ماون!
یان چەماون ، لە خەما چەوساون!
کاوە بۆ کوتکی شکا و بێ چەرمە
خوێنی لاوان کە لە بیر کا، شەرمە
مچە گردەڵ کە بەرەو باو بۆوە
گشتە یان پێچی درا و خاو بۆوە!
هەڵۆ کل بوون کە لە هێلانەی کەل
چینەیان چۆنە لەسەر خوانی قەل* !
بیری ئەو ناوە لە بیریان ماوە!
یان لە پای ڕازەوە هەڵدێراوە!
هیچ لەبیریانە لە لێڕی بیران
جەنگی سەر چامە لە بەرپێی پیران!
ڕۆژ بە دوومانەوە وەک کوێنی ڕەش
لاشە دەتلانەوە لە خوێنی گەش
لە فڕۆکانەوە بۆمبا باران
کڵ و پێشمەرگە بە ئاگر خاران
لە تەقە و دووکەڵی گەرمی گڕی شەڕ
خوای ترس پیشی هەڵات کوێر و کەڕ
کێ پەنای گرت لە ڕەهێڵەی تۆپان!
چەند سەکەت بوون عەرەب و جاش تۆپان

سەردەمی خەنجەری کورد هاتەوە گەڕ
سەری وشکی دەبڕی و گۆشتی تەڕ
خوێنی پیسی لەشی سیسی عەرەبان
گوڕ و فیچقەی بوو لە بان تیغی دەبان
باوی بوو گاڵتە بە مردن کردن
کورد وەسەر کەوتن و ، دوژمن مردن
دێتە بیریان کە لەسەر نوێنی سەنگ
ببوە لای لایێی شەوان دەنگی تفەنگ
»دۆڵی سەفتێ»، «بنی پێرس»، «ڕێزان*«
خۆش بوو چۆن بوو لە بەریان بێزان !؟
سەرچیای شیرن و چای بەر باران
لای ئەوان تاڵ بوو لە تاوی تاران*!
دەس و چاو ئێستە ئەوەند تێر و پڕن
سەد هەژار ڕەنگە بە پووشێک نەکڕن
***
سەیری جوانی بکەین
مانگە هەرچەند بەلەزی دەیزانم
لێمگەڕێ تۆزێ تریش بڕوانم
سەربکێشم بە بڕێک ماڵاندا
چاو بگێڕم بە خەت و خاکاندا
کیژە بۆکانی خەواڵووی نازن
پاوپووز ڕووتن و پێسیر وازن
زەردەمەم دیارە کە خاوەن نووستون
بۆ پشوودان لە کراس دەرکەوتوون
پرچی ئاڵۆز کە لەسەر لەشیانە
شەوەزەنگ داگری ئاوی ژیانە
مانگ ئەگەر تیشکی بدا ڕێنوێنە
شنەبا بسک و کەزێ بزوێنە
هەلە تا چوی خەواڵوو مەستن
تا جەزایەرچی بەیان بێ هەستن
دڵە خۆ تێرکە لە سەیری جوانی
ڕێت هەیە چەند بە خەیاڵ بڕوانی
***

تا من گەشتێك دەكەم
تا من و گیانی پەژارم تاوێ
تۆزێ لەم دەورە دەگێڕین چاوێ
»وشتەپە« داخۆ فەقێلەی دێنێ
یان لە جێی ئێمە پەپوو دەخوێنێ*
كوا سولەیمان و لەچی تاراوە
تەخت و قالیچە نەما با ماوە!
شێخی شێخلەر بە ڕواڵەت بەختە
دووەربەختی بۆ هەژاران سەختە
خێوی كێو خاسە كەوێ لە شوێنێ
بە دڵ ئاواتە كە بۆم بخوێنێ
ڕاوكەری تەپلە بەسەر لەو ناوە
لە گەڕە و داوی لە دەورەی داوە
***
ماڵاوایی
گیانە مەودا كەمە ئاسۆ سوورە
بیر نەبووڕێتەوە ڕێمان دوورە
وەختە لێڵایی لەبەر چاو بڕەوێ
خێڵی شەو كۆچەرە، ڕۆژ دەردەكەوێ
بەهومێدم كە بە ڕۆژی ڕۆشن
تیشكی ئازادی خەمان داپۆشن
ئاشكرا ڕوو بە گوڵ و گوڵزاران
بێمەوە و بێمە دەس و ڕووی یاران

***
ئەی موكریان بە خودات دەسپێرم
یادگار وەرگرە ئەشكی سوێرم
بێ منیش خۆش بە مەكۆی بیروەرەیم
تۆ بەجێ هێشتنە هۆی كوێرەوەریم

***

*ماسوو (ماسویَ :(گوندێکە لە نێوان لاجان و سابڵاغ دا، کە هەژار لە سەردەمی منداڵی دا ماوەیەک لەویَ ژیاوە.
*قازیاویَ (قازیاوا) : گوندێک بوو لە نزیک سابڵاغ .هەژار زۆر منداڵ بووە لە هەواری ماڵە خالانی ، کە لەسەر چەمی ئەو گوندە هەڵیان داوە، ماوەیەک ڕای بواردووە. قازیاوا هەر ئێستیَ کەوتۆتە ژێر ئاوی بەربەندی مەهاباد.
*پردی سوور: پردێکی سەرچۆمی مەهابادە، کە دوای لێدانی بەربەند، پردەکەیان وێران کرد.
*باغی مکایل : باغێکی سەرسەوی پەنا چاری مەهابادە. سەیرانگەیەکی خۆش و دڵگرە .
*ماملیَ : مامۆستا محەمەدی ماملیَ ، هونەرمەندی دەنگخۆش و پیاوچەکی کورد.
*خەزایی : کێوێکە لە باکوری مەهاباد ، کە کانیاوێک و دارێکی تووی سووری لە داوێن دا بوو.
*گڕاو : سەرچاوەیەکی ئاوی گۆگردییە کە بۆ دەرمانکردنی نەخۆشینی پێست زێدە بەکەڵکە. ئاوی گڕاو هەرکە لە سەرچاوەکەی کل دەبێت، دەبێتە بەر. لە دەور و بەری شاری مەهابا دا چەندین سەرچاوی گڕاو هەیە.
*تاقە دار : تاک دارێکی کۆن و قەدیمەیە کە لە داوێنی خوارەوەی شاخی گردەڵە، لە ڕۆژئاوای شاری مەهاباد ، لە سەر گۆڕێکی کۆن شین کراوە.
*مەحمودکان : گردێکە لە باکوری شاری مەهاباد، کە سمایل خانی سمکۆ ، لە سەر ئەوە گردە، دژ بە هێزەکانی ئێرانی شەڕی کردووە .
کوژراوەکانی هێزی ئێرانی لە داوێنی ئەو گردەدا چاڵ کراون.
*بداغ سوڵتان : ئەمیرێکی بەناوبانگ بوو کە حکومەتی سابڵاغ و دەور وبەری پیَ سپێردراوە. بداغ سوڵتان لە ئاوەدانکردنەوەی سابڵاغ دا دەورێکی بەرچاوی بووە. مزگەوتی سوور لە کارەکانی ئەو ئەمیرەیە. بداغ سوڵتان سکەی پوڵی وردی لێداوە ، کە جنسەکەی کە (مس) بووە.
*غەوسی سانی : شێخ عوبێدولاهی شەمزینان، سەرهەڵدان و ڕاپەڕینێکی ڕێبەری کردووە کە دژ بە دەسەڵاتداریی ئێران شەڕی کردووە و هەتا

نزیک شاری مەراغەی لە دەست ئێران ئەستاندۆتەوە.

*شێخ بابا : شێخی غەوساباد بووە. شێخ بابا بە پێی قەولێک کە ڕووسەکانی سەردەمی تزاری پێیان دابوو لە ڕاپەڕینەکەی دا یارمەتی پێ بگەیەنن بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان، بەمەرجێک دژ بە عوسمانییەکان شەڕ بکەن، بەڵام روسەکان هیچ یارمەتییەکیان پێ نەبەخشی .تورکەکان هاتن و شێخ بابا و حەمەحسێن خانی سەردار و سەیفەدین خانی سەقزییان گرت و لە سێدارەیان دان.
*مەلیك زادە : سەرکردەیەکی ئێرانی و خزمی شای ئێران بووە. مەلێکزادە بە لەشکەرێکی گرانەوە هێرشی هێناوەتە سەر شاری سابڵاغ. سمایل خانی سمکۆ لە شەوێک دا هێرش دەکاتە سەر مەلیکزادە، هێزەکەی تێک دەشکێنێت، مەلیکزادەش دەکوژرێت.
*کۆمەڵی ژ. ك : کۆمەڵەی ژیانەوەی کەرد لە ساڵی 1942 دا لە شاری سابڵاغ پێک هاتووە.
*حەمەحسێن خانی سەیفی قازی ، وەزیری بەگری و فەرماندەی لەشکری کوردستان کە دەگەڵ پێشەوا قازی محەمەد لە دار دران.
*قۆرغ : قۆپییەک بوو لە مەهاباد ، کە وەژێر ئاوی بەربەندی مەهاباد کەوت. بای قۆڕغێ بەناوبانگ بووە.
*گەڕەکی شوانان :گەڕەکێکی شاری مەهابادە، کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو گەڕەکە، لە لادێکانەوە هاتبوون.
*چاوڕەق : ناوی بنەماڵەیەکی بەناوبانگی مەهابادییە، کە کاری پزشکی و شکستەبەندی و ئۆرتۆپێدیی یان کردووە.
گەرماوی شوجاع : حەمامی شوجاعولمولك. حەمامێکی کۆن بوو لە مەهاباد.
*شادەروێش : مزگەوتێکە لە گەڕەکی ڕزگەیانی شاری سابڵاغ ، کە حەوشە و حەسارێکی خۆشی هەیە . سەوزەیخانە و دار و درەختەکەی بەناوبانگ بووە.
*ڕزگەیی : گەڕەکی ڕزگەییان . یەکێک لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری سابڵاغ ، کە ماڵی مامۆستا هەژاریش ماوەیەک لەو گەڕەکە دا بووە.
مەولەوی: نازناوی بنەماڵەیەکی کۆنی مەهابادییە، کە کاریان پزیشکی و دەرمان کردنی خەڵک بووە. کوڕەکانیان هەر ئێستا دوکتۆرن.
*خاڵە سوورە :چاکێك بووە لە گەڕەکی قوڵەقبران لە شاری مەهاباد، دارێکی سەرسەوزێشێ بەسەرەوە بووە. ئێستا نە گەڕەکی قوڵەقەبران

ناوەکەی ماوە و نە چاك و نە دار.
*خانەقای نەهری: تەکیەی بەرەی شێخەکانی شەمزینانە کە شان بە شانی مزگەوتی هەباس ئاغایە لە مەهاباد دا.
*شێخ عەبدولقادر و شێخ محەمەدی شەمزینی لە لایەن تورکانەوە لە ڕێی ئازادیی کوردستاندا بەدار داکران.
*گەڕەکی خڕێ: یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری سابڵاغە، هەژار لەو گەڕەکەدا لە دایک بووە.
*گەڕەکی قوبڵە: یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری مەهابادە. وەفایی، شاعیری مەزنی کورد لەو گەڕەکە ژیاوە.
*گەڕەکی ئەرمەنیان ، سەرپلوسك ، پشت قەلا ، گەڕەکی حاجی حەسەنی: لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری مەهابادن.
*عیمادی: ناوی چاپچییەکی قەدیمەی شاری مەهاباد بووە.
*حەمە شەل: کەبابچییەکی قەدیمەی شاری مەهاباد بووە.
*بەستێنی چۆم: تەنکاوێکی چۆمی مەهاباد بوو کە جێگای سەیر و سیاحەت و ئاوهێنانی ژنان بوو.
*چوارچرا: گۆڕەپانێکە، کە بۆ یەکەمجار لەوێ ئاڵای کوردستان هەڵکرا. هەر لەو مەیدانەشدا پێشەوا و سەدری قازی و سەیفی قازییان بەدار دا کرد.
*خاڵەمین: شاعیرێکی سەردەمی کۆماری کوردستانە لە مەڵبەندی مەهاباد ژیاوە.
*سەید عوبەیدیلا ئەیوبیان: نووسەر و مامۆستای زانکۆ تەورێز، کە چەند کتێبی بەیتی کوردی وەك : مەم و زین ، خەج و سیامەند ... ی چاپ کردووە.
*مزگەوتی سوور: کۆنترین بینایە کە بداغ سوڵتان سازی کردووە . مزگەوتی جامیعی مەهابادە.
*گەڕەکی دارۆغە ، کۆپین ئاوا: دوو گەڕەکی شاری مەهابادن.
*داشامەجید: ناوی کێوێکە لە لاشانی مەهاباد دایە لە بەری ڕۆژهەڵات.
*لالەباس: ناوی باغێکە لە مەهاباد.
*مێشەی کورتانی : ناوی دارستان و مێشەیەکی لە مەهاباد.
*باغی سیسە: باغ و سەیرانگایەکی خۆشی مەهاباد بووە.
*کانی مام قەمبەران: سەیرانگایەکی کۆنە مەهاباد بووە.
*گومبەزان: گۆڕخانەی بەرەی بداغ سوڵتانە و زیارەتگایە لە مەهاباد.
*باغی شێخی: سەیرانگا و باغ و بێستانی خۆش بووە لە مەهاباد کە ئێستا

نەماوە.
*زاوا و بووک : کێوێکە لە نزیک مەهاباد.
*سارەوانان :گوندێکە نزیک مەهاباد. دایکی هەژار کە سەیدزادە فاتمی کچی سەید حەمەدەمینی نوورانییە، خەڵکی سارەوانان بووە.
*بەسری: کێوێکە لە نزیک مەهاباد دا، کە زۆر جاران دز و جەردە خەڵکیان لێ ڕووت کردووە.
*سەید وەقاس: کێوێکە لە نێوان چۆمی مەجیدخان و قەمتەرە و بورهان دایە. گۆڕێکی لێیە بەناوی سەعدی وەقاس، کە جێی زیارەتە.
*کاك: نیاز مەلا ئەمجەدی قەڵایە کە نازناوی شیعری کاک بوور.
*سوڵتان و سلێمان ئاغا : دوو دەوڵەمەندی چۆمی مەجید خان بوون، کە ئەم دووە دژی کۆمەڵەی ژ.ک بوون.
*ئێساکەند: گوندێکە لە موکریان، کە هەژار سەردەمێک وەک فەقێ لەوێ خوێندوویەتی.
*کاکەجان: چاکێکە نزیک گوندی سەهۆلان ، کە کور و کچی لاو دەچنە سەری و نیازی لێ دەخوازن .
*پیری بورهان: نیاز شەمسەدین شێخ یوسفی بورهانییە کە لە خانەقای شەرەفکەند نێژراوە. سەردەمێک هەژار لەوێ فەقێ بووە.
کانێ دولمان و لوساوکان: دوو جێگەن لە خانەقا.
*سەید ڕەشید :عالم و شاعیر و قسەخۆشی بەناوبانگ، کە دوو نازناوی هەبووە ؛ چاوەش و شەهید.
*نورانی: سەید حەمە سەعیدی کولیجیی عالمی بەناوبانگ، کە مامی دایکی هەژار بووە.
*مەولانا: مەلاسادقی خەلیفەی شێخی بورهانە کە پردی قەرەقشلاغ و قەڵاتاسیان و ڕێگەی بەسری ئەو دروستی کردوون. مەولانا خاڵی باوکی هەژار بووە.
*شێخ محەمەد: زانایەکی زۆر بەناونابگی موکریانە کوڕە گەورەی شێخی بورهانە و بەسەر خانەقا ڕاگەیشتووە .
*باغی فاتێ: باغێکە لە نێوان خانەقا و گوندی شەرەفکەند دا.
*گوارتە گوێ: کێوێکە لە نێوان خانەقا و گوندی ئاشی گوڵاندا.
*شەرەفکەند : گوندێکە باوکی هەژار لەوێ لەدایک بووە.
*باغی مەلا، ئاجیکەند، خوراسانە، ئاشی مەلا ، تازەقەڵا ، سەردەراباد ، تەرەغە ، باغچە، سەرباخچە ، چواردیوار، قەرەڵی ، نۆبار، عیلماباد ، کانیە ڕەش و ئاشی گوڵان : چەند گوندێکن لە موکریان.

لالەش : شوێنێکی پیرۆزە لە لای موسڵ، جێی گۆڕی شێخ هادییە و زیارەتگای ئیزەدییەکانە.
*پیرسڵەمان، کۆشکی خات زارا ، میرقاز، پێمەڕەی فەرهادی = چەند شاخێکن لە دەور و بەری خانەقا و شەرەفکەند و ئاشی گوڵان و...
*لێڕەبیر ، چامە ، سەفتی، بنی پیرس، ڕێزان، چیای شیرن = ناوی چەند شوێنێکن لە بارزان.

*پیرمحەمەد = چاکێکە لە گوندی بوغدەداغی لە موکریان. دەڵێن خۆڵی دەور و بەری ئەو چاکە دەرمانی تیراوێیە.
*سەفین و هەڵگورد و پیرس و پیران= ناوی چەند چیایەکن لە باشووری کوردستان.
ئاگری ، ساسۆن، تۆرۆس و جوودی = ناوی چەند چیایەکن لە کوردستانی باکوور دان.

## چەپکێک لە هۆنراوە جۆربەجۆرەکان

### هەر کوردم

بە دەربەدەری یان لە ماڵی خۆم
لە خاکی عەرەب ، لە ئێران و ڕۆم
کۆک و پۆشتە بم، ڕووت و ڕەجاڵ بم
کۆشکم دە قات بێ، وێرانە ماڵ بم
ئازا و ڕزگار بم، شادان و خەندان
یان زنجیر لە مل لە سووچی زیندان
ساغ بم جحێڵ بم، بگرم گوێ سوانان
یان زار و نزار لە نەخۆشخانان
دانیشم لە سەر تەختی خونکاری
یان لە کۆلانان بکەم هەژاری

کوردم و لە ڕێی کورد و کوردستان
سەر لە پێناوم و گیان لەسەر دەستان
بە کوردی دەژیم، بە کوردی دەمرم
بە کوردی دەیدەم وەرامی قەبرم
بە کوردی دیسان زیندوو دەبمەوە
لەو دنیاش بۆ کورد تێ هەڵدەچمەوە

***

نامرادێک
لاوەکان، گەورە کچان، نازداران
دلبەران، دڵتەڕەکان، دڵداران
دە مەڕۆن تاوێ بمێنن لێرە
فاتحایێکی بخوێنن خێرە
لە نێو ئەم گۆڕە هەژار نێژراوە
زۆر لە ڕێی ئێوە جەفای کێشاوە
ژینی خۆی کرد بە فیدای خۆشیی کورد
لە ڕێی ئازادی بە ناکامی مرد
تۆ خودا کاتێ کە ئازادیو سەند
ڕەگەزی خوێنمژەکانو هەڵقەند
کیژ و کوڕ هەرچی بە لاما لادا
پێم بڵێ و پایێ بە قەبرم دادا
ئەی هەژار بەسیەتی مردن هەستە
موژدە بێ مەوتەنەکەت سەربەستە

***

سوێندێکی گەورە 1954

لە خەو ڕاپەڕن چی کرێکارە
مەچنە کار ئەمڕۆ یەکی ئەیارە

خەبەر بنێرن بۆ نزی و دوور
کۆ وەبن، هەڵکەن ئاڵایەکی سوور
ئاسنگەرێ بێ کوتکی لەسەر شان
ڕەنجبەرێ خۆی و داسێکی دەم پان
لە دەوری ئاڵا سروودی جێژن
بە ئاهەنگی بەرز تێکڕا ببێژن:

***

ئەی سەرمایەدار پیسی پارە زۆر
سپی لەش، دڵڕەش، زگزلی خوێنخۆر
تەمبەڵ ، تەوەزەل، ترسنۆک ، خوێڕی
بانبانکی نوستووی سەر کۆمای زێڕی
تاکەی تا کەنگێ دەکوژی ، دەبڕی!
ئێمە بەو پارەت دەفرۆشی ، دەکڕی!
چۆن من شەو و ڕۆژ ئارەق بڕێژم
قەت تامی چەوری و شیرنی نەچێژم!
چۆن گەنم چێن بم ، شک نەبەم نانێ
چ دینێک ئەمە بە ڕاست دەزانێ!
دەسکاری من بێ کۆشک و سەرسەرات
کەچی جێ خەوێ لە من ببێ قات!
حەریری بەرتان من چنیم ڕستم
ئێوەم پۆشتە کرد هەر خۆمم چنیم!
تاکەی دارتاش بم بێ دەرک و کورسی
جۆڵا و جوتێر بم بێ دەرپێ وبرسی ؟
تاکەی فرمێسکی ژن و منداڵم
ئارەقی ڕژتووی ڕەنجی چەند ساڵم
دەدەی بە ئارەق خۆت سەرخۆش دەکەی!
من نەخۆش دەکەی خۆت بێهۆش دەکەی!
ئەی زاڵم دنیا بە پێچ و دەورە
بلەرزە و ببیە ئەم سوێندە گەروە:

***

سوێندم بە یەکەم جەژنەکەی ئەیار

سوێندم بە هێزی چینی کرێکار
سوێندم بە چرچ و لۆچی ناوچاوم
دەستی قەڵشاوم، لاقی سوواوم
سوێندم بەو باسکە کوتک دەوەشێنێ
سوێندم بەو پشتەی کۆڵ دەڕفێنێ
بە گاسن، بە داس ، بە شانی بە قوڕ
بە پەستەکی کۆن ، بە چۆغەڵەی شڕ
سوێندم بە ڕەنگی زەردی بێ نانان
سوێندم بە نووستوی شەو لە کۆڵانان

***
بە شۆڕشگێری ئۆکتۆبری مەزن
پاڵەوانانی هەرگیز نابەزن
پارێزگارانی ستالینگراد
گیانفیدایانی سۆڤیاتی ئازاد
سوێندم بە لاوی کۆریا، بە چین
بە زەبر و زەنگی لاوانی ڤێتمین
بەو توونسیانەی لەبەندا ڕزاو
سوێندم بە زەنگی، بە ڕمبی ماوماو
بەو خوێنەی پردی بەغدای کرد ڕەنگین
بە ڕاپەڕینی کانوون و تەشرین
بەو توودەی ناوی کرد لە دنیادا
بەوانەی کوژران لە مەهابادا
سوێندم بە بارزانی چۆڵ کراو سوتاو
بە قودسی و عیززەت ، خێروڵڵا و خۆشناو
سوێند بە ئاشتی ، کۆتری سەلام
بە ژین و خۆشیی گشتی و بەردەوام
هیچ سات و کاتێ دەست هەڵناگرم
یان هەق دەستێنم یان بۆی دەمرم
"ماکارسی" ، " دالاس" ، " دەویت زەناوێر"
بە مانگ وەڕینیان بێ سوودە، بێ خێر
تێم بەردەی هەزار "کای" و " سینگمان ڕی"
ئاواتی دوا ڕۆژ هەر دەهێنمە دی

بۆمبای میکرۆب و هیدرۆژ ، ئاتۆم
دەیخەمە ملت و دەتهاوێمە گۆم
دە هێندی دیکەش وەک زاهیدی و شات
نووری و بەیار و مەلای پیساوات*
هاکا توانەوە بوونە بەفری پار
هەرپایەدارە هێزی کرێکار
لافاوی مێژوو بە گوڕ و تاوە
پیسی و پڕ و پووش دەخاتە لاوە
بەزم دەگرین لەسەر گۆڕی زۆرداران
دنیا دەبێتە جێژنی هەژاران

.........................................................
*پیساوا : نیازی مامۆستا هەژار لە پیساوا، ولاتی پاکستانە.

ئامۆژگاریی هەژار بۆ شێرکۆی کوڕی

شێرکۆ کوڕی خۆشەویست و ژیرم
زاخای مژیم و هۆش و بیرم

پنج و ڕەگەزی دڵ و گیانم
خونچەی شەقی باخەکەی ژیانم

هێشتا بە تەمەن مناڵ و کاڵی
وەک دەربەدەریيم دوازدا ساڵی

هەرچەندە کوڕی منی هەژاری
دوا ڕۆژی هەژارە نادیاری

لێم ڕوون نییە پاشی چیت بەسەر دێ
هیوام گەلێ پێتە ببیە مەردێ

مەردێکی بەکار و چاپک و زیت
بیرێ بکەی و بزانی تۆ چیت

دەردی گەلەکەت بزانی چۆنە
بۆت دەرکەوێ چەند برینی کۆنە

خانی لە هەزار و سەت ژیاوە
ئەو کاتە لە ئێمە چۆن دوواوە

حەفتا و حەوت لە سێسەتیش چوون
پێشتر لەوە کوردی ئێمە مردوون

ئەودەم کە هەیان بوو میری بۆ خۆ
ئەمڕۆ کە پساوە ڕایەڵ و پۆ

بووین ئەودەمە پشکی تورک و تاران
زۆر ئێستە خراپترین لە جاران

نەوتت کە ژیانی ئەورووپایە
بۆ تۆ نییە تێری شەو چرایە

بێگانە لە نیشتمانی ئێمە
تێر و قەڵەون بە نانی ئێمە

خۆمان هەموو کوێر و کوتر و برسی
ژین کورت و ئەویش دەگەڵ مەترسی

نابێ بە زمانی خۆ بخوێنین
ناشێ کە هەناسەیەک هەڵێنین

کوژران بە هەزار هەزار لە لاوان
ئازادی خوازی ببووە تاوان

ئێستەش لەسەر ئەم ژیانە تاڵەش
پاش ڕژتنی هێندە خوێنە ئاڵەش

کورد هەر لە خەوی نەزانی دایە
هەر پێکەوەیان گڕ و هەرایە

بێگانە پەرستە خۆ نەویستە
بۆ هاوڕەگەزی کەڕ و نە بیستە

بۆ یەکتری دوژمن و نەیارن
بۆ نۆکەری تا بڵێی لەبارن

ئەو چاخە کە خانی پێی ژیاوە
فەرموویە هەرا لەسەر دراوە

وێستێکە هەزار ئەوەند چرووکین
بۆ پوڵێ لە تای تەرازوو سووکین

خۆ هەرچی دەخوێنێ پیت و نیوێک
ئەو دەچێتە کەل و گەلیش لە شیوێک

لای شەرمە کە هەر بە کوردی بدوێ
بۆ چارەڕەشی مە بۆگەنە خوێ

خۆی ناودەنێ مل بە زەنگی پێشڕەو
دەت داتە دەسی دژت وەکوو کەو

زۆرزانە لە کار و باری هەرکەس
ئاگای لە ژیانی خۆی نییە و بەس

ڕەنگن هەموو کەسک و سوور و شینن
کوردایەتی زۆر بە کەم دەبینن

کێ هۆنەری کوردە یان هونەروەر
کەم باییترە لە توور و گێزەر

وا بیر مەکەوە ئەمەم درۆیە
بۆ ڕاستی نموونە بابی تۆیە

کاتم ئەوە گەییە سی و نۆساڵ
هەر ساڵە لە پار پتر ژیان تاڵ

دڵخۆشی لە ڕووپەری ژیانم
هەر هێندەیە ناوەکەی دەزانم

ئاوارە لە نیشتمانی خۆمم
ئاواتەخواز بە ژینی دۆمم

واڵادەس و دڵ پڕ و پرژارم
سەرباری هەژاری، دەردەدارم

هەر مانگە لە دێیەک و لە جێیەک
هەر ڕۆژە میوانی خانەخوێیەک

دەرکێ نییە دادی بۆ بنێرم
هەردێ نییە خۆمی لێ وەشێرم

کوردایەتییە گوناە و سووچم
وەک مۆمێ دەساچم و دەسووچم

هەرچەندە کە نیمە هیچ دەرووی ڕوون
هەر دژ دەگەڕێ گەڕانی گەردوون

دەستم لە هومێدێ بەر نەداوە
چاوم لە پسانی بەند و داوە

پێم وایە دووا بە ڕۆژی ڕەش دێ
زۆر ناچێ کە باو و ڕۆژی مەش دێ

جا با پتریش بە دەرد و کوڵ بم
با ڕووت و کڵۆڵ و داخ لە دڵ بم

سەد هێندە پەژارە لێم وەکۆ بێ
کورد هەر دەبێ ڕۆژێ سەربەخۆ بێ

با من بە هەژاری بچمە ژێر گڵ
کورد ڕۆژێ دەبن بە گوڵ لەسەر چڵ

هەر هێندە تکام لە تۆیە ڕۆڵەم
مەڕوانە کە ئەم شڕ و شڕۆڵەم

زۆرتر لە منیش کز و هەژار بی
بێ یار و نزار و لێو بەبار بی

دەربەس مەبە ، بۆ گەلت بکۆشە
ژەهراوی لەسەر بنۆشە ، خۆشە

باوکی تۆ چلۆن بوو شوێنی بگرە
حیزانە مەژی ، بە مەردی بمرە

***

من و بولبول

بولبول ئەی یارەکەی دێرین
خونچیلانەی دندووک زێڕین
هاوفەردی زووم بۆ هەژاری
هاوڕێی پێشووم لە دڵداری
وەبیرت دێ پایزی پار!

ڕەشپۆشیی دەشت و زەردیی دار
گژە و گڤەت لە با دیبوو!
هەوای پێش تەرمی شادی بوو
دەیدا خشپەی گەڵاڕێزان
خەبەری مەرگی ئازیزان
بەژن و باڵای نێرگزی مەست
لە گێرەی گزرەدا پێ پەست
سوێسنە و مێلاقەی زەرد و سوور
بوونە دەستەچیلەی تەندوور
کلوە بەفری درشت و ورد
چۆن سەر زەوی کفن دەکرد!
کووندە بوومە ، قەلی ڕووڕەش
کەلەپووریان دەکردن بەش
من و تۆ برسی و بێ پەسیو
لە کونجێ خزیو، بێ بژیو
دەگریاین بە بانگ و هاوار
بۆ خونچە، بۆ گول ، بۆ بەهار

***

دەمگوت هەتا سەر وانابێ!
چاوت لە بەزەیی خوا بێ
بڕوانە لە بای شەماڵی
سەرمایەی سەرمای ڕاماڵی
سەرمایەداری سەرمایە
بێ سەرمایە و بێ سەر مایە
ڕێژنەی بارانی ئازاری
ئازار بوو لە زستان باری
دوو پۆلوو کەوتن لە حووتا
ڕیشی سپی چلان سووتا
گەرمیی هەرد و گرمەی هەواران
شۆڕشێ بوو گۆڕیان دەوران
تەرزەی گرد و خوناوکەی ورد

چاوی کڕێوەی سپی کرد
تەزووی پیرێژن کوژاوە
ئاویان لە جێ ماڵی ناوە
ڕۆژ کەوتە کۆشکی کاوڕی
گیسکی مسیان بۆ سەربڕی
بە دەنگی زوڵاڵی بۆقان
سەوچاوەی دڵناسک تۆقان
قوڕاوە سووری بەهاران
دەرمانە بۆ دەردەداران
ڕای ماڵی پووش و چیلکە و چاڵ
جێژنە و دەبێ خاوێن بێ ماڵ

زەماوەند
نەورۆزەی زەردی زێڕینە
زەردی لە لێوان ببینە
بەناز پێ لە زەوی دەنێ
بەرەو نەورۆز پێدەکەنێ
گەزیزە موژدەی هێناوە
پێش پەیکی گیابەند و خاوە
هەر بمێنێ شای بەهارێ
دوو بووکان دێنێ بە جارێ
ئەرخەوان بووکی نەورۆزە
دەشت لە نیسانێ پیرۆزە
گۆوەندە و خۆشیی دڵانە
بەزمە و ئاهەنگی گوڵانە
شایلۆغان لە ماڵی شا بێ
دەبێ چی بێ و چی تێیا بێ!
سەیرێ بکە لە گوڵزاران
تیپ، تیپی ناسک و نازداران
کەسک و سوور و زەرد و عابی
قاوەیی و شین و عەننابی
نەباتی و کاڵ و ئاڵ و گەش

سپی و مۆر و بنەوش و ڕەش
ڕۆنیاسی و خاکی و پەمبەیی
بۆر و سپات و سوورمەیی
ڕازاوەی ڕەنگی خوا کردن
لەو سەر زەماوەندە گردن
سۆسەنبەر و مالۆچە و گوڵ
میخەک و لاولاو و سونبوڵ
تێکەڵ بوون وەک کەزێی یاران
لێک هاڵان وێنەی دڵداران
کۆڕی بەیبوون و هەڵاڵە
لە کن نێرگزی چاو کاڵە
سوێسنە و بێژان و بەڕۆنە
نەشە و گەشەی هەردوو بۆنە
کەلەم کاشوور و گۆززروان
کوا جوان بکۆخێ لەبەر وان!
لالەهەباسی شۆخ و شەنگ
تافتەی لەبەر دا بە حەو ڕەنگ
سەیدی پاتۆڵ زەرد ، گێلاخە
چاو دادەگرێ لە قازیاخە
دۆریە و مەندێی ی باڵا بەرز
شاتەڕە و جاترەی سەد تەرز
سەیدووکەی سەر گوڵینگەدار
ئەسپەندەر نوشتەی چاو و زار
نەعنا و ڕیحانە بۆن خۆشن
حەتران لەو ناوە دەفرۆشن
کڵاو بن چادری هەڵداوە
ڕێواس بەناز هەڵوێستاوە
وەنەوشە و بەژنی ببینە
چەند خشپیلە و نازەنینە!
گوێی لە سێوەڕە گرتووە
ملی لەسەر خوار کردووە
چاو لەو پەپوولە نازدارە
چەند دوو دڵ و هەرزەکارە!

به شەو لەگەڵ شەمێی ژوانە
بە ڕۆژ لە دەوری گوڵانە

***

گوێ بگرە لە هەوری نیسان
کەوتۆتە گرم و هۆڕ دیسان
دڵ خۆشە بە خرۆش و جۆشە
زاوای دەشتی سەوزە پۆشە
گوڵاو پرژێن دەکا لە سەر
دەینەخشێنێ سینە و کەمەر
تارای بۆ نارد لە مێلاقە
بۆی چنیوە کەوای تاقە
لە گوڵە بابوونە و کەنێرە
هێرۆ و شەشپەڕ و شلێرە
شێستپەڕ گوارەی پڕ پەرەنگە
ئەڵماس تنۆکی ئاونگە
ملوانە لە چڵی بیزایە
پڕ چنوور و بەڕەزایە
نیشانی یار ڕۆژی مارە*
لێزگەی هەمیشە بەهارە
یاقووتی خاشخاشی تێدا
جا خوا ئەو بەختەی بە کێ دا!

.............................................
*مارە = ڕۆژی مارەکردن ، ڕۆژی نیشانەکردنی بووک.

سەیرانکەر
بۆ سەیری بووک لە هەر لاوە
گیا و گژ سەری دەرێناوە
کەنگر، کوڕادە، کاردوو، پنگ
پرپرە، تیسوێ ، هەڵز و شنگ
تاڵوو، تۆڵەکە، کووزەڵە
لووشە و چەقچەقە و ڕیزەڵە

پۆڵکه و ترشۆکه و ئاڵەکۆک
گوێ بەرخە و مێۆرد و کێفۆک
قورینگانه و زەرتکی ڕەنگ
تاڵیشکه و خوشلیک و غەربەنگ
مێکووک، ڕەکێشه، ئەسپەناغ
ئاڵقەتیز و گێلم بەرباغ
تەنانەت کارگی کەمایه
هاته دەر بۆ تەماشایه
چی ڕووگرژ و بێن ناخۆشه
خراونه کەنار و گۆشه
کەکرەی تاڵ بێ هەواڵ ماوه
سیر له دەرکی مار ڕواوه

سەمای دارانه
کۆلکه زێرینەی پاش باران
تاقه بۆ پێشوازیی یاران
هاژەی هەڵدێر خوڕەری ئاوان
لاوک بێژی بووک و زاوان
سەوڵ و سنۆبەر، بیی و چنار
به مەی بەرامەی بای بەهار
سەرخۆشن خۆ ڕادەژێنن
باوەش له یەکتر وەردێنن
داری سێو و هەڵووژە و بێ
قەیسی و خۆخ ، بادام و هەرمێ
له ژێر سێبەری کوڵووکان
جوانتر له سەد تازه بووکان
کفر و گەز و گوێز و چاڵووک
گوێز و بووز ، بەن و بەلاڵووک
سپیندار و گێلاس و توو
مازوو، دەموکانه و بەڕوو
دەس گیرانه له هەر لاوه
سەما دەکەن به دەم باوه

بەزمی باڵدارانە
سوڕە و سێروو دەڵێن بەستە
دارکوتکە دمبەگ بە دەستە
دوڕنا زوڕنای خۆی هێناوە
پەپوو دەهۆڵی جۆش داوە
زەردە زێڕە دەخولێتەوە
ئەوەی دەیڵێ نایلێتەوە
پاساری لاوی گوێ سوانان
هاتە ناو ڕیزەی خۆشخوانان
کوڕکوڕ توڕاندیە شمشاڵی
شێلاقە خۆی لێ هەڵماڵی
بەگا و قولّتە و گۆریەچنە
هەوێردە و چووڕەپۆپنە
قومری و پۆڕ کەوتنە دیلانێ
سوێسکە ڕەوتێک باش دەزانێ
کەندەسمە بەناز خۆی نواند
تۆبەی تاق تاقکەرەی شکاند
ڕەش بەش لە دەستی کەڵکایە
قاژوو ماسیگرەی لایە
دۆی سوورەقانگ ، زڕەکەوە
بۆرچین سەرسەوزی گرتەوە
کۆتر و کەو سەرچۆپی کێشن
شۆخ هەمیشە هەر لە پێشن
شاهۆی سوفیلکەی ناو ئاوان
لەو سەریەوە بۆتە گاوان
کاسەڵەشینکە و سریلە
دەڕوانن لە سووچ و سیلە
مۆزە شینەش بە چووزەلە
گوێلکی خستۆتە هەلوەلە
لەکلەك بەیان و ئێواران
لێدەدا سێ تەپڵی سواران
پەڕەسلێرکە پۆل بە پۆل

ڕمبازیانە لە دێ و لە چۆل
باڕە و کارەی ماک و زایە
سەمای هێنایە سەمایە
قاز و قورینگی عاسمانێ
ڕیز بە ڕیز دێنە سەیرانێ
سەرسامن بۆی ڕادەمێنن
باڵ و سەر ڕادەوەشێنن
باشووی بەگ، سەقر و بازی خان
چەکمەڕەق ، شمقاڕ و تەڕلان
هەڵۆ و شەهێن پەڕینە کێو
زۆردار ڕێی نییە بێتە نێو
دەرکتران سیسارک و خەرتل
خوێنتاڵن کەچەڵ و زگزل
خۆشی خۆشی مێشەنگوینە
جەنگەی شیرە هەڵمژینە
هەر لە خۆی دێ دەسڕەنگینی
سەیری شانە و شانشینی
لە چێژەی گوڵ و گوڵووکان
ئاخنی شەش گۆشەی دووکان
پوختەی پەلکی شین و سوورە
شیرن و سپیی ناو پلوورە

بە مراد گەیشتنی بولبول
جا ئەی دەنگخۆشەکەی چەلەنگ
بوێژەکەی بەناو و دەنگ
لەناو باڵدار و گولاڵە
تەنیا جێگەی تۆ بەتاڵە
گوڵ ئامێزی گرتۆتەوە
خونچە خۆی ڕازاندۆتەوە
جێت لەسەر چڵ چاکراوە
بەڕەی گەڵا داخراوە
داران ئامادەی گوڵباران
لێت پیرۆز دیداری یاران

وا تۆ گەییتە کامی دڵت
شاد بە بەدیداری گوڵت
بچریکێنە تا دەتوانی
بخوێنە بە کامەرانی
سروودی جێژنی ئازادی
ڕزگاری لە نامرادی

جوێ بوونەوە
ماڵیاوا کۆنە هاودەمم
با دوور بی لە ئاهی سەردم
تۆ خۆش ، من هەر ژیان تاڵم
ناتوانی ببیە هاواڵم
واباشە بەجێم بهێڵی
هەر خۆم وێڵ بم لە شوێن خێڵی
دەردی من یەکجار گرانە
هەڵوەداییم بۆ دەرمانە
مەمکولێنەوە ، مەمدوێنە
سووتاوم پێم مەدرکێنە
گوڵی من لە یارت جوانتر
یارم لە گوڵ خانومانتر

چەند جوانە!
مانگ و ڕۆژ، گەلاوێژی گەش
گڕی ئاگری بە شەوی ڕەش
بۆنی خۆش، گوڵی ڕەنگاوڕەنگ
باریکیی شیعر و خۆشیی دەنگ
زەنگی سەرشەوێن، فیکەی شوان
خشپەی وردە ماچ لە جێ ژوان
تیشکی مانگ لە ئاوی کانی
سروەی شنەبای بەیانی
لە دوور قاسپەی خاسە کەوێ
نازی بووکی هەوەڵ شەوێ

سپیایی سینە، شینی خاڵ
سوورایی کوڵم و لێوی ئاڵ
زەردیی گەردن و ڕەشیی موو
تەنگیی دەم و گوشادیی ڕوو
سافیی هەنیە ڕاستیی کەپۆ
چاڵی چەن ، کەوانەی ئەبرۆ
مەستیی چاو، قولاپەی برژانگ
سایەی پەرچەم لەسەر لاجانگ
خڕیی مەم ، بڵندیی باڵا
گاڵەی تاقانە لە ماڵا
زەردەی زەردپەڕ لە سەر ئاو
پرووشەی باران لەبەر تاو
خوڕە و چاوئەندازی هەڵدێر
بازی ئاسک ، ئاوازی بلوێر
کەروێشکەی گەنمی بەهاران
بەفری هاوێن لە پەساران
دیمەنی کێو و نەخشی دەشت
هەر لێرەوە هەتا بەهەشت
هەرچی خۆشن هەرچی جوانن
کۆیلەی جوانیی کوردستانن

جێی ئازایان
کوردستان جێی گوردی کوردان
بێشەی شێردڕ و نەبەردان
لانکی زەردەشت و مەهاباد
پایتەختی شاهانی ماد
جێگای تاجی کەیخوسرەوی
کە بووی باجی هەموو زەوی
مەیدانی گودەرز و ڕۆستەم
کۆشکی دڵداری زین و مەم
ڕێبازی بارامی چۆبین
جێ ڕازی فەرهاد و شیرین
هەزار فەریدوون و کاوە

سەری هەڵداوە لەو ناوە
لە ڕۆژهەڵاتی كۆن و نوێ
لە مێژوو بنۆڕە و بدوێ
لە لایەن كوردی ئازاوە
كێ ساغ ماوە و داغ نەكراوە!

هێندێك لە پاڵەوانەكانی

قازی، مستەفا بارزانی
شێخ قادر و غەوسی سانی
ئیحسان، شێخ سەعیدی وەلی
شێخ مەحمودی داری كەلی
سمكۆ، خانی ئەردەڵانی
شۆڕەسوارانی بابانی
پاشای سۆران، میری بۆتان
خاوەن زۆران، كەڵی كۆتان
بازو میر عەلی جان پۆڵاد
غانم و دەیسم و قوباد
بوموسلیمی خوراسانی
زەندی و ئەیوبی و ساسانی
ئەردەشێری شوانكارە
چەند شێرێكن لەو نزارە

هێندێك لە بوێژەكانی
مەولەوی و بێكەس و خانی
نالی و مەحوی و بەردەشانی
كوردی و گۆران و جزیری
حاجی و حەمدی یو حەریری
پیرەمێردی گردی یارە
چەند خونچێكن لەو گوڵزارە
وەك تۆ فرزەندی ئەو خاكەن

بولبولی ئەو ئاو و خاکەن

گوڵی سەرچڵ
ئەو کوردستانەیە یارم
بۆ وییە وێڵ و هەژارم
دلبەرم ئەو دەشت و کێوەن
ئەو پڕ نەوت و زێڕ و زێوەن
کە عەمباری ڕۆژهەڵاتە
سەرچاوەی دەجلە و فوراتە
بۆ کێوانی سەربەرزی وی
عاسمان سەردەکا نەوی
فریشتە و هۆریی بەهەشتی
دێنە سەیرانی پێ دەشتی
داری کەوناراى دنیایە
کوێی دڵگر و خۆش نومایە
گشت تێکوڵ و لق و پۆپە
کوردستان گوڵی سەرتۆپە

ئاخ لە بەختی ڕەش!
ئاخ چبکەم گەردوون تەرەسە
کوردستان ئەمڕۆ بێکەسە
یەخسیری دەستی تورکانە
داگیرکراوی ئێرانە
یان پاپەتیی مارمێلکەخۆر
تێی ڕۆهاتوون دەیبەن بە زۆر
گۆڵ و دەڵ و ڕێوی و چەقەڵ
دەگەوزن لە جێی فیل و کەڵ
فسۆس و کەروێشک و دەڵەک
لانیان کرد لە بورجی بەڵەک
شەمشەمە و مشکە تۆپیون
لە قەڵای سەردار خزیون
لە جێی خانزادی شەقلاوە
وشتری گەڕ ئیخ دراوە

دەک فەلەک تەختت وەرگەڕێ
ئاگر لە بەختت هەڵگەڕێ
تورکی حیز، تریاکیی ئێران
خونکارن لە سەر دلێران
پڵنگی ڕازی کوردستان
نەتەوەی ڕۆستەمی دەستان
پاشماوەی خانی لەپ زێڕین
دیلی چەنگی دێڵی خوێڕین
کێ دی تەنانەت بە خەون
ئازا وەبن حیزان کەون!

فریودرام
کوردی مەردم بە زەند و بەند
هاسان نەدەکەوتمە کەمەند
دووبەرەکی هێزی بردم
شێخ چەك و نینۆکی کردم
مەلای پیس، دەستی گرێ دام
بۆ ناو زەلکاوی فڕێ دام
ئەنجا هێزی ئیستیعماری
پای پێدادام بە یەکجاری
نوقمی قوڕی دیلی کردم
دزی گەلان ڕۆژیی بردم
لەناو بەرگی شارستانی
بە ناو ئینسانی، نەمزانی
تا ڕووبەندی دیموقراتی
لاچوو ڕووم دی بوو بە قاتی*
کوللۆ کەوتە دەغڵ و دانم
هەر بەخۆم بردی تالانم
چەند زۆڵە کوردێکی زل کرد
گرێی ناموسیان بۆ شل کرد
بە چەند قۆشێک سازی کردن
هەرچەندی ویستی لێی بردن
گەنم و جۆ و توتن و دراوم

زێڕ و نەوتی بە لێشاوم
نەوتی کرماشان و کەرکووک
"ستی " لەندەنی کردە بووک
هی " رمان " و بەختیاری
بۆ " وال ستریت" چوو بەدیاری
دەلەسە و دەویت زەناوێر
گوێلکن بە پەمۆی ئێمە فێر
چەرچیی مل چرچی مام چەرچیل
بە نان و ڕۆنم بوونە فیل

---

*وشەی دیموقراتی حروفی (ڕوم دی)ی لێ لاچێ، وشەی (قاتی ( دەمێنێتەوە.

***

زمانم لێ داگیر کرا
مێشک و دڵم خورا ، برا
خوێنیان مژیم، گۆشتیان خواردم
ئێسکیان بە سەیان ئەسپاردم
لای تورکە نیوەی کەلاکم
عەجەم بەربوونە لوولاکم
عارەبیش بەشی خۆی دەوێ
قەپێک لێرە قەپێک لەوێ
هەر لە یەک سەعات و یەک دەم
عەرەبم و تورکیشم و عەجەم
پێم دەڵێن تورکی کێوانی
یان لە قەحتان و شەیتانی
یەك دەڵێ مێژوومان یەکە
ئەگەر بشت خۆم دەنگ مەکە

***

خەیاڵ دەکەن!
بەڵام بە هەزار هێندە دەرد

نامرم، سەریان داوە لە بەرد
من بە بانیپاڵ نەمردم
چەنگیزخان قڕی نەکردم
سەلیبی چوون، مرد گەزنەفۆن
کورد بە زیادەوە هەروەک خۆن
شا عەباس لەبنەی نەهێنام
تۆزی بە با بوو من هەر مام
بە شێر نەخورام ، دێڵە ڕێوە
دەم خوا ؟ های بە کلکی خێوی!
گەل خواردن گەلێ گرانە
نایبا ڕیخۆڵەی ئەمانە
سەد ساڵ جوورابم، خورابم
قورسم هەرگیز هەزم نابم
پاروێکم چیڕ و دڕکاوی
کێ بمخوا دەبڕم هەناوی
لە چاویان ڕا سەر دەردێنم
هەتاسەر هەروا نامێنم
بەرخ هەر بن سەوە نابێ
ڕۆژێک دێ شاخی پەیدا بێ
زەوی دەگۆڕێ و دەگەڕێ
هەردەم دێنێتە ڕووپەڕێ
لەو چەرخ و خول و گەڕانە
سوڕێکیش بەشی کوردانە
بەرەو منیش دەخولێتەوە
نۆرەی گورزی مەش دێتەوە
نەخوازە لەم چەرخی بیستە
گاڵەی دنیای کمۆنیستە
ڕێ و شوێنی لینین هەیە
سۆڤێتستان و چین هەیە
ئاڵای بەرزی کرێکاری
هێناویە موژدەی ڕزگاری
بە ملیار خەڵکی ڕۆژهەڵات
ئازا لە ئیستعمار هەڵات

چین داری بۆ ئەمریکا کرد
کەللەی سەری پڕ لە کا کرد
چەند چەرخە ئینگلیزی گلاو
هێندی تاڵان کرد و چڵپاو
ڕفاندی ، کڕاندی ، ساندی
دیتت چۆن کۆمەڵی گاندی
بە ڕۆژو، بە تەشی ڕستن
تەنەکەی دە کلکی خستن!
سۆکارنۆ هۆلەندی چڕاند
هیندوچین فەرانسەی دڕاند
لەو کونەوە بێ ئەو بایە
چۆن هەلێکی منیش نایە ؟!

شۆڕش دەکەم
هاکا دیت منیش ڕاپەڕیم
خوڕیم، گوڕیم ، چڕیم ، دڕیم
سەپان و پاڵەی دڵ پۆڵا
لە شار و لادێ، لە چۆڵا
کوتک لە سار شان ، داس بە دەس
دەبێتە شۆڕشی هەر کەس
خۆ وەشێرن خوێڕی و قزە
بمرێ هەرچی حیز و دزە
چەک لە چنگ زۆردار دەردێنم
نق بکا سەری دەشکێنم
ڕیشی ڕیخنی شێخ دەبڕم
مەلای لابەلا زگ دەدڕم
زۆڵە کوردی بێ ئابڕوو
دەنێرمە سەر هۆرەی بەڕوو
ڕووی گوندی خۆران ڕەش دەکەم
ئاو و زەوییان دابەش دەکەم
لە کیژ و لاوی جووتێران
پاڵەوانی نەوەی شێران
هێزی کوردستان پێك دێنم

تۆڵە لە دوژمن دەستێنم
بگا و مەکوش، گێلدم، ئوێلدم
یا یوممە ، تێناگەم کوردم
کێ خواردوومی دەڕشێتەوە
کێ لێی دام لێی دەدرێتەوە
لە گورگان کڕیاری پۆستم
بۆ بێ زۆریان یار و دۆستم
ئەویش بێ بەش بوون وەکوو من
ئەویش خوێنی مژتوون دوژمن
دوژمنی گەروە ئیستیعمار
ڕۆژهەڵات کوژەی شینە مار
مەردم خۆرەی چەرموو چەرم
بێ بەش لە شوورەیی و شەرم
لە گەڵ تورک و عارەبی چاک
گەلی ئێرانی باش و پاک
دەست لە قەدی یەک وەردێنێن
ڕیشەی ئیستیعمار دەردێنین
حەزیای خوێنمژی هەژاران
بە گەل دەکەین بەردەباران
سەر و گوێی بە داس بە چەکوچ
دەبڕن دەجنن چ کوڕ چ کچ
ڕێ نادەین خەونیش ببینێ
کە زل بوو لە سەر زەمینێ
لێی حەرام دەکەین ئەو خەوە
مەرگی سەگی هار چل شەوە
پشت بە کام هێزی دەسپێرێ
کوێ ماوە خۆی لێ وەشێرێ!
کوودەڵەی دەلەسە و چەرچیل
ئێمە دەیان گرین بە دیل
وەك گیسکی مس لە بەهارا
بن کلکیان دەکەین بە دارا
نیشتمانمان دەکەین بژار
خوێنمژ دەبڕێن لەسەر هەژار

جا نۆرەی بەزمە
ئاڵای سێ ڕەنگی ڕەنگینم
لە پۆپەی بەرزان دەبینم
دەلەرێ و دەشەکێتەوە
دەردم سارێژ دەبێتەوە
برین لە گیانم نامێنێ
دەم و دەست گۆشتەزوون دێنێ
ئەوەدەم بە کوێریی نەیاران
گشت خاکەلێوەی بەهاران
بۆ جێژنی ڕەزگاری و سەر ساڵ
کیژۆڵەی کورد و کوڕ و کاڵ
باڵابەرزان و چاومەستان
دێن لە هەموو لای کوردستان

لە کوێ و لە کوێ ؟*
لە عەزیز ، بتلیس و ماردین
زارا و مەکس و کلس و عیفرین
دەرسیم ، ئەرزەڕۆم ، ئەزەنجان
بایەزید و سعرد و وان
مەلاتییە و دارندە و بۆستان
دیاربەکر و جزیرا و پالۆ
مووش و چوڵەمێرگ و ماکۆ
کنج و کەیفی و ساریقامیش
سوێرەک و عەنتاب و مەرعیش
عاموودە و دەرباسی و ژەنگار
تا قامیشلی و عەرەب پینار
ئەسکەندەروون ، ئۆرفە، خەرپووت
عەقرە، مووسڵ، عمارە ، کووت
میدیاد، ئامێد، دهۆک، زاخۆ
کفری، کەرکووک، هەولێر و کۆ
ڕەواندز، هەڵەبجە، پێنجوین
مەندەلی و تووز و خانەقین

کرند و قەسر و خوسرەوی
شووشتەر و بەندەر پەهلەوی
بەندەر و دەیلەم و بەهبەهان
خورەماباد و ئیسفەهان
مەلایەر ، مەسجیدسولەیمان
سوڵتان ئاباد و تویسەرکان
شەهری کورد ، سنە، هەمەدان
کرماشان، سەقز هەورامان
سەردەشت و بانە تا شنۆ
تا ورمێ و دیلەمان و خۆ
نەغەدە و شاپوور و سەلماس
لە هەردوو بەر ئاوی ئاراس
مياندواو، شاهین دژ ، بۆکانی
مەهاباد و سولەیمانی

................................................
*هەر شارێکی لە لەم بەندە دا هاتووە، هەژار بە کوردستانی داناوە.

چییان لەبەر دایە!

بە بەرگی ئاڵ و واڵاوە
هەر چۆنێ لە ناویان باوە
شاڵ و شاپک، کەوا و پاتۆڵ
جل تەنگ و نێفەک فشوفۆڵ
کوومی سوور، شەدە و جامانی
تەپلەی لەبان خۆلامانی
کەوای شۆڕ، فەرەجی و پەستەک
مرادخانی و عەبا و کورتەک
کنجی دێوجامەی بۆتانی
ئەنگوچکی شۆڕی سۆرانی
دەرپێی سپی و چۆغەی گرژاڵ
کەوش و کەڵاش دەبنە هەواڵ
کوڕگەل هەموو شۆخ و لاوە

بۆ کچانیان چاوەچاوە

جل و خشڵی کیژان
هەزار ڕندێ و شەمێ و زارا
سەرتاپا خامەک و خارا
سایە و کراسی کەمبەرچین
لە هەزار ڕەوشی و نازەنین
پەلک و قەتارە و گێلگێلە
کەمبەرە زێو، پشتێند شێلە
لاسەرە و بازن و خرخاڵ
کلۆجەی مەخمەر و سوخمە ئاڵ
تۆق و تەلیسم و لاگیرە
گۆبەرۆک ، ملوانکە لیرە
گوارە و کرمەک و دەرزیلە
میخەکبەند و ئەنگوستیلە
حەمایەڵ ، بازووبەندی قۆڵ
لوولە و قاش، خرینگە و مەنگوڵ
بەرموور، گەردانە، پاوانە
سڵسڵە و پڵپڵە و لەرزانە
خەزێم شۆڕ، دەسماڵ بە ئۆیە
کلاوزێڕ بە دابی کۆیە

چەند جۆر هەڵپەڕکێ
لە سەرچنار گوڵعەنبەر
یان لە سەر کانی مام قەنبەر*
دیتت لە سەد لا هەڵ خلا
ڕاست و چەپی و هۆزی و مەلا
ڕۆینە و سێ پێیی و شێخانی
دووپێی چۆمی مەجیدخانی

..............................................................
کانی مام قەمبەران = سەیرانگایەک بوو لە مەهاباد، کە ئێستا خانوبەرەی لێ ساز کراوە.
بەزم گێڕان

دەنگخۆش دەیگێڕن بە بەندان
حەمەجەیران، عەلی خەندان
تایەر تۆفیق، گەردی و ڕەمۆ
کاوەیس و ڕەشۆڵ و کوڕۆ
ئەحمەد گۆزەڵ، مەجە گڕوێ
هەلامە وحاجیلە و ماملێ
فەوزیە و ئەلماس، مریەم خان
نەسرین شیروان، مەنیج حەیران
سێلاق، سەرشین، کەریمەکوێر
مامی سێوانیش بە بلوێر
سەرمابردوو بە دەفەوە
هەڵدەخولێ بە بەر سەفەوە
مەلا کەریم، قادری ئەوڵا
هەرکەس لە سووچێ لە هەوڵا
بە تار و دنبەگ بە گەواڵ
چووزەلە و کەمان و شمشاڵ
لاوی یەزیدی بە تەنبوور
دیلان جۆش دا ساز و سەمتوور
لێدەن شێخۆنادۆ و خەمە
دەهۆڵ و زوڕنا دەم دەمە

هەی لەو گۆوەندە
دەبێتە بەزمی ڕەش بەڵەک
شیر و شەکر دەگەن بە یەک
هەڵ تەکانە دەست کوشینە
ڕان بە ڕانە ڕێك خشینە
ڕەشماڵی زولفی تاتایی
دەدرێن لە سمێڵی خورمایی
ئارەقی سپی و ئەسمەران
دەتکێنە سەر گۆی خەنجەران
خوێی سەر کوڵم و تەنکەلێوان
دەرژێتە نێو شەکرەسێوان
خۆبادانی کەمەرشلان

چاوبڕکێنەی چاو بە کلان
لەرزەی مەمکی باڵابەرزان
خێر و خۆشی دەکەن هەرزان
بە گەل خەرمەی پانی بەرز
دەلەرزێنن دڵی عەرز
لەسەر شینی سپی بەلەک
شێت دەکەن مەلەک لە فەلەک
کەفەڵی خڕ و مەچەکی پڕ
هەڵخڕێن کەسەر دەکەن قڕ
کێ بە کێیە لەوان دەمان!
کوڕ هەلە دەس بەرنە مەمان
هەرچەند خۆش ڕابوێرن کەمە
چ ڕۆژی لۆمە و لەقەمە
دوای ئەو هەموو ژینە تاڵە
دەرد چێژتنی ئەم چەند ساڵە
چێژی ئازادی دەچێژن
کوڵ و کۆ بە خەم دەڕێژن
دڵ بۆ یەکتر دەکەنەوە
سرتە دەکەن بە کەنەوە
دڵ تەڕن و لاون و نازەنین
سرتە و پێکەنین هەر چ نین
لەو دەم، لەو ڕۆژە، لەو جێیە
ماچ و مووچیش عافووی لێیە
زیقە و تریقەی منداڵان
حیلکە و کۆکەی کۆنە ساڵان
دایك و بابی کیژ و لاوان
یەکتر دەدوێنن بە چاوان

دەبینەوە هاواڵ
بولبول منیش ئەودەم سازم
وەك تۆ دەگەم بە دڵخوازم
دەڕەوێ تەمی هەژرایم
بەس دەکەم لە ناڵە و زاریم

بەستەی دڵداری دەبێژم
دوڕ دەڕێژم، گوڵ دەنێژم
دەدەم پەسندی ئازادی
دنیایە داخنم لە شادی
دەگەڵ تۆ دا دەچریکێنم
بەستەی خۆمت پێ دەخوێنم

ئەمەش بەستەکەیە
کوردستان ئەی نیشتمانم
هێزی دڵ ، ئارامی گیانم
جێی سەربڵندی و شانازی
تا دڵ دەخوازێ دڵخوازی
گوڵی پشکوتووی بێ پاییز
سیس نابێ و ناوەرێ هەرگیز
مێشکم ، هەستم ، بیرم ، ژینم
بۆ تۆن ئەی گیانی شیرینم
تا زیندووم هەر تۆی مەبەستم
خۆشم دەوێی دەت پەرەستم
بشمرم لەشی بەگڵ بوو
دەروێنێ چەند گوڵ و دڕوو
گوڵم بۆ دەستی دڵدارت
چقڵم بۆ چاوی بەدکارت
گیانیش دەفڕێتە عاسمانت
ئەوسا تێر دەکا سەیرانت

***

شەوێک لە زیندان

شەوە، نیوە شەو، دنیا خامۆشە
وەک ئازیەتباران زەوی ڕەشپۆشە

هەناسەێ سارده با دەناڵێنێ
هەور دڵپڕه، ئەسرێن دەڕژێنێ
تاک تاک ئەستێره له ئاسۆی مەلوول
دەڕواننه شینکه وەک پیاوی فزوول
ڕمبەێ پێلاقه و هەڕەشەی زۆردار
شەقەی قامچی و دار تێکەڵ به هاوار
پڕیشکه و فیشقەی خوێنێکی ئازاد
له دار و دیوار دەنووسێ «هەی داد!»
گزیر دڵڕەقه، مووچه ، خوێنتاڵه
کوتەکی دەستی زالمی زاڵه
له جوابی ناڵه دەحیلکێتەوه:
کوردی؟ جۆن بەزەم پێت دا دێتەوه!
ئازادیخوازێ؟ بەشت مردنه
هەقێ کوردستان پاماڵ کردنه
تۆی چقڵی چاوی هێزی ئیستیعمار
دەبێ بت نێژم له ڕێگەی دۆلار
نووسێوته «مۆسکۆ کۆشکی کرملین،
قەڵای ئازادیخوازانی زەمین،
باڵداری هیوای وەتەنپەرستان،
جارێک با بێته سەیرێ کوردستان!»
به کام دەست ئەمەت نووسی ببڕم
کام دڵ ئەمەی خواست تا هەڵیدڕم!
زمانم بەستووی نەمهێشت بخوێنی!
بەچی پەڕەندەی هومێد دەدوێنی!
چی بۆ دادەنێی! کوا دان و ئاوت!
فرمێسکی چاوت ! جەرگی سووتاوت!
ئا !.. هیوات وایه تێبگا مەبەستت
له زڕەی زنجیری پێوەند و دەستت!
ملێۆنەهای کورد دەتەوێ بژین!
ڕزگار بن له ژێر زۆری و خوێن مژین !
نەتزانی ڕێگەی هیوات گیراوه!
دەرفەت بڕاوه چارەت نەماوه!
دەروەم تەنیوی به پۆلا و ئاسن

هەیهاتە بێڵم گەلان بتناسن
کوندی پەیمانی بەغدات لە سەرە
دان و ئاودەری ئایزەنهاورە
عەدڵی لاوازی شەل و نوقوستان
ناگاتە چیای ڕژدی کوردستان
****
لە ناو هەنیسک و غەڵدەی خوێنی دەم
جواب دەداتەوە نووزێک بە حاستەم:
»لێم بدە ، بدڕە، بکوژە، ببڕە
ناموس بفرۆشە ، نانی پێ بکڕە
خوێن بمژە، پێستم لە دار هاڵێنە
لە سەر من ئێستا هێزت بنوێنە
جەمی دوارۆژی تۆش و ئیستیعمار
چل شەوە مەودای ژینی سەگی هار
هێزی هەژاران ، دنیا داگرە
بۆ پووشی گیانی خوێنمژ، ئاگرە
هاکا گوڕاندم لە چیا و نواڵان
گیانی تۆ و ئاغات دەڕوا بە تاڵان
نامێنن نە تۆ نە زناوەرت
بە داری بێستان دادەکرێ سەرت
دەبێ پەیمانتان مردار بێتەوە
لەسەر گۆڕینگۆ سەر بنێتەوە لەسەر گۆڕێنگۆ = لەسەر گۆڕی ئێوە
بە کوێری چاوی داڵاس و بەیار
کورد دەبن ڕزگار ورد دەبن نەیار
لەناو گەلاندا خۆمان دەنوێنین
بە سەربڵندی سەرمان هەڵدێنین
یاری ئازادی دەگرینە باوەش
ڕۆژی ڕوون هەڵدێ لە پاش شەوی ڕەش«

***

تەڵقین بە کوردی

ئەی بەندەی خودا کوڕی کارەکەر *
گوێ بگرە لە ناو گۆڕی تەنگەبەر
لە دنیای بێ فەڕ کۆچت کردووە
لە ئەولای بێگەڕ خانووت گرتووە
تۆش وەک مردووی تر وەک هاو فەردانت
دوو پەری خودا دێنە سەردانت
دووی ددان زەردی سووری چاو شینن
بە گورز و مەتاڵ، بە تەوەرزینن
تۆزێ مڕ و مۆچ ، ڕوو تاڵ و تفتن
بەڵام وەک دەڵێن « بە گفت و لفتن«
هەزار جار بڵێن «کوا مەڕنەمووکە«
بێدەنگ، قڕ و قپ، لێت نەیە جووکە
گەر تێشت هەڵدەن، پێشت دادەن تف
بڵێ من کوردم، زمان مایەعرف
لە دار مەترسێ، گوێ مەدەرە جوێن
ناچاریان بکە بە کوردی بدوێن
ئەمجار بە زمانی شیرینی کوردی
خۆت هەڵە مەکە، هێدی ، بە وردی
بێژە : لالۆ ! خوا و پێغەمبەر هەقە
کوردی هاسان و عارەبی ڕەقە
باسی مردن و هەستانی دوایی
خۆ ماندوو نەکەن ، با بە خۆڕایی
بڵێ : « کورد لە سەر دنیا مردووە
دەمێکە قیامەت لەوان ڕابووە
بێ بەرگ و پێڵاو، بێ نان و بێ دۆن
تورک و عەجەم و عارەب دەیانخۆن
کورد ژێر چەپۆکە و ئەو خاوەن زۆرن
برای موسڵمان، موسوڵمان خۆرن!
با لە خوا پرسێن : گەر دین ئەمەیە
گەپ و گەمەیە و زیانی مەیە
دینێ بەشی کورد بخاتە ژێر لیچ
سەد بار گەورە بێ، نامەوێ وە هیچ«
وەرامی بەهەشت زۆرباش دەزانی

خۆت خەڵکی چیا و دەشتی کوردانی
باس بکەی ئاو و هەوای کوردستان
کوڕ و کچی جوان ، پێ دەشت و کوێستان
شینایی و کانی و باغات و میوە
پێت باوەڕ دەکەن بەهەشتت دیوە
دۆزەخیش وێنەی لە دنیا پڕە
چۆڵی عارەبی گەرم و قاقڕە.

---

*بۆ پیاو (بەندە) دەکار دەکرێ، بەڵام بۆ ژن دەبێ بگوترێ:
کارەکەرێ خودا کچی کارەکەر

فرمێسکی هەژارێک

لەسەر چۆمی «ڕاین» لە ڕۆژگارێ جارێ
تکا ئەشکی ئاوارە کوردێ، هەژارێ
بە سەریا خوڕی : کوێندەریی ئەی تکەی سوێر
ئەتۆ و ئێرە چی دەنکە فرمێسکی بێ خێر ؟
وتی : « ئاوی چاوی کوڕی کوردستانم
لە دەجلە و فوراتڕایە ناو و نیشانم
لە زێڕینە ڕوود و تەتاهۆ سەلامێ
لە بەژنت لە چل چەشمە پێمە پەیامێ
لە سەرخۆبە ئەی ڕاینی شۆخ و شیرین
شتێک بووین ئەمەش گەرچی ئێستا ئەسیرین
هەرچەند دیل و بێچارەشە نیشتمانم
ببەخشە لە جێی تۆی بە خۆشتر دەزانم
چ کەڵوە و چ سیروان و ئاوێزەڕۆیە
بە دیمەن هەمووی شۆخ و شەنگتر لە تۆیە
ئەرگە لادەچێ ئەم تەمەی نەگبەتیمان
بە خاوەن دەبێ کێو و چۆم و زەویمان
لە دڕکی نەیاران بژارێکی دەکرێ
هەزارانی وەک تۆ لە شاباشی دەدرێ
بەڵێ ئاوی چاوم لە دڵ هەڵکزاوم

له ڕێی سەربەخۆبوونی کوردان ڕژاوم«
وتی ڕاین: « ئەی تیشک و هێزی دڵی من
وەرە باوەشم ، بت بەمە بەحری بێ بن
بە هاوار و دادت موحیت بشڵەژێنە
لە چەپگەردی گەردوون بەشی کورد بسێنە«

---

دجلە، فورات، زێڕینە ڕود، تەتاهو، چل چەشمە، کەڵوێ، سیروان، ئاوێزەڕۆ : ناوی چەند چەم و ڕوباری کوردستانن.